# تۆفانی گەڵا

گابرییێل گارسیا مارکێز

و لە فارسییەوە: قادر عەلیخا

چاپی یەکەم.......................... ٢٠١٧




# تۆفانی گەڵا

ناوی کتێب: تۆفانی گەڵا

نوسینی: گابریێل گارسیا مارکیز

بابەت: ڕۆمان

وەرگێڕانی: قادر عەلیخا

هەڵەچن: کارا فاتیح

پیتچن: ڕزگار عەلیخا

دیزاین: فازیل کەوڵۆسی

چاپخانەی: تاران

نۆرەی چاپ:چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

تیراژ:١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی(١١٣٢) ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە.

بۆ دەسکەوتنی بڵاوکراوەکانی ناوەندی سایە بەتاکو کۆ..

ناونیشان: سلێمانی – شەقامی پیرەمێرد – بەرامبەر اعلاناتی شێرکۆ

Emil: nawandy.saya@yahoo.com ٠٧٥١٢٤٦٠٥٨٣

بۆ مامۆستام: کاك فەتاح ئەمیری

کە تیشکی قەڵەمەکەی چرای ڕێگامە

وەرگێڕ

کۆمپانیای مۆز، لە ناکاو وەك گەردەلوولێکی فیگرتوو بە نێو شار وەر بوو، دوابەدوای ئەو تۆفانی گەلایش سەری هەڵدا. تۆفانی گەڵا گێژەنێك بوو لە پاشەڕۆی مرۆییی شارەکانی ترەوە هەستابوو، ئەو تۆفانە وێنەیەك بوو، کە زۆر لە ئاسەوارە شوومەکانی شەڕی ناوخۆ دەچوو. گێژەڵووکەیەکی سامناك بوو، هەموو شوێنێکی پڕ کرد لە بۆنی ئارەقەی لەش و مەرگی شاراوە، هەرەسی ئەو ئازار و نەهامەتییە زۆروزەوەندانە بوو کە بە درێژاییی ساڵەکانی پێشوو بە شانی خەڵکدا هاتبوون. لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکدا، بە سەر شاریدا ڕژاند و شەقام و کۆڵانەکانی شەناخن کرد لە پاشەڕۆ و زبڵ. لە ناکاو ئەو پاشەڕۆ و زبڵانەیش هاوکات لەگەڵ هەناسە سەرشێت و چاوەڕوان نەکراوەکانی تۆفاندا، بەرەبەرە کۆزیلکەیان بەست و کۆزیلکە هاوشانەکانیش دایانە پاڵ یەك، هەتا وای لێ هات ئەو شەقامە باریکەی سەردەمێك ڕووبارێك لەو سەری و حەوشەیەك بۆ مردوەکان لەو سەرییە بوو، بوو بە شارێکی جیاواز و ئاڵۆز، کە لە زبڵ و پاشەڕۆی شارەکانی تر پێك هاتبوو.

پاشەڕۆی عەمبارەکان، نەخۆشخانەکان، هۆڵی ڕابواردنەکان و ناوەندی بەرهەمهێنانی کارەبا بە هێزی لە پڕان نەهاتوو و لەناکاوی خۆیان، دەگەییشتنە نێو شار و لەگەڵ تۆفانی گەلای مرۆڤەکاندا تێك دەئالان.

ئەو پاشەڕۆیانە لەو ژن و مێردانەوە پێك هاتبوون، کە هێسترەکانی خۆیان بە بارگەوبنە تایبەتییەکانیانەوە، کە ئەغڵەبیان یەخدانێك، یان بوغچەیەك جلوبەرگ بوو، دەبەست بە کۆڵەکەی چوارپێکانی مسافیرخانەکەوە و پاش دووسێ مانگ دەبوونە خاوەنی ماڵێك و دووسێ دڵدار ناسك و پلەیەکی بەرزی سەربازی، لەبەر ئەوەی ئەوانە درەنگ گەییشتبوونە گۆڕەپانی شەڕ و بێ ئارەق بۆی دەرچوو بوون. تەنانەت پاشەڕۆی ئەوینە ناکام و لەبارچووەکانیش لەگەڵ گێژەڵووکەکەدا دەگەییشتنە لای ئێمە و ماڵێکی چکۆلەیان لە دار و دەوەن بۆ خۆیان ساز دەکرد، لە سەرەتاوە ئەوانە ماڵێکی کاتی و سەرپەنایەك بوون بۆ شەوێك ژیان و گوزەران تێدا کردن. پاشان شەقامێکی ئاڵۆز و نادیار و، وەردەوردەیش دەبوو بە گەڕەکێك لە ناوەندی شاردا، کە لەوێدا هەموو کارێك سەربەست و ڕەوا بوو.

لە هەناوی ئەو بۆرانەدا، ئەو تۆفانی ڕووخسارە نامۆیانەدا و ئەو تاوڵانەی بە درێژاییی ڕێگاکان هەڵدرابوون و ڕیزیان بەستبوو، پیاوەکان لە سەر شەقامەکان بە بەر چاوی خەڵکەکەوە جلەکانیان دەگۆڕیێ و ژنەکان چەترێکیان کردبووە سێبەری سەر سەریان و دەستیان لە سەر چەمەدانەکانیان دانابوو، هێسترانیش بە یەك بە دوای یەکدا لە بەرانبەر گۆڕەپانی پێش موسافیرخانەکەدا لە برسان دەتۆپین و هەر لەوێ فڕێ دەدران، ئێمە یەکەم مرۆڤەکانی ئەو شارە بووین، بووینە ئاخرین مرۆڤەکانی شار، لە بەر ئەوەی غەوارە و ناشارەزا بووین.

کاتێك ئێمه له دوای شەڕ هاتینه ماکاندۆوه، خاکه باش و به پیت و بەرەکەتەکەیمان بەر دڵ کەوت. دەمانزانی بمان نەوێ و نەمانەوێ، ڕۆژێك تۆفانی گەڵا هەر سەر هەڵدەدا، بەڵام مەبەستەکەی به لای ئێمەوه شاراوه بوو، نەم دەزانی چی به دەمەوەیه، له بەر ئەوه کاتێك زانیمان له بەفرانباردا دەگاتێ. هەر ئەوەندەمان پێکرا، دەورییەك و چەقۆیەك و چنگاڵێك له پشت دەرگاکه دابنێین و چاوەڕوان بووین تا ئەو کەسانەی پێ دەنێنه ئێرەوه، بزانن ئێمه کێین. لەو سەروبەندانەدا بوو که بۆ یەکەمین کەڕەت گوێمان له دەنگی شەمەندەفەر بوو. تۆفانی گەڵا خولێکی لێ دا و چوه پێشوازیی شەمەندەفەرەکه و خوڵ و پێچێکی دا، ئیتر وزه و تاقەتەکەی پێشووی پێ نەما، بەڵام یەکگرتن و لەیەکنزیکبوونەوەی زیاتر پەرەی سەند. بەرەبەره به شێوەیەکی سروشتی توایەوه و لەگەڵ ڕۆحی به پیتی خاکدا ئاوێته بوو.

ماکاندۆ ١٩٠٩

ئەوە یەکەمین کەڕەتمە چاوم بە مردوو دەکەوێ. لە بەر ئەوەی ئەمڕۆ نەچوومەتەوە بۆ قوتابخانە، هەست دەکەم ڕۆژی یەکشەممەیە، بەڵام نا، ئەمڕۆ کە چوارشەممەیە، کۆتوشەڵوارێکی مەخمەریی سەوزیان لە بەر کردووم، لە چەند شوێنێکییەوە هەست دەکەم بە بەرم تەنگە. دەستم لە ناو دەستی دایکم دایە و بە شوێن بابەگەورەمەوەین، هەر هەنگاوێك هەڵ دەهێنێتەوە بە کوێرەکوێر و بە یارمەتیی گۆچانەکەی بەر پێی دەپشکنێ و دەکەوێتە سەر ڕێگاکەی خۆی (لە بەر ئەوەی لە تاریکیدا چاوەکانی باش نابینن و لاقیشی شەلە) کاتێك دەگەمە ئاستی ئاوێنە باڵانوێنەکە، لە بەژنی خۆم دەڕوانم و هەر لە پەنجەی پێمەوە هەتا تەپڵی سەرم، موویەموو بە چاو دەپشکنم. لە نێو ئاوێنە خڕە پنۆك پنۆکەکەدا سەرتاپای جلوبەرگەکەم سەوزە، هەر ملیوانی کراسەکەم سپی دەکاتەوە و ئەویش هەر تاوناتاوێك وەك دڕوو گاز لە لا ملم دەگرێ و ئازارم دەدات. لە بەر خۆمەوە دەڵێم: ئەوە ڕاست بۆ خۆمم و ئەوڕۆیش هەر لە ڕۆژی یەکشەممە دەچێ.

هاتووینەتە ئەو ماڵەی تەرمەکەی لێیە. لە ژوورێکی دەرگا داخراودا، کە مرۆڤ توانای هەناسەهەڵکێشانی نییە، دەنگی قرچەقرچی تینی هەتاو لە شەقامەکانەوە خۆیان بە پەردەی گوێچکەکاندا دەکێشن... هەر ئەوە و هیچی تر. هەوا بێ جووڵەیە و دەڵێی چیمەنتۆی مەییوە و مرۆڤ هەست دەکات، دەکرێ وەك تەختەیەکی پۆڵایی بە سەریەکدا لوولی بدەی. بۆنی تابووتەکە لەو وەتاغەی کە تەرمەکەی تێدایە دەگاتە لای ئێمە و خۆی دەکات بە نێو لووتماندا، بەڵام تابووتەکە لە ئێمەوە دیار نییە. لە سووچێکی دیوەکە سەری هەڵۆرکێکیان[1] بە سنگێکەوە هەڵواسیوە. بۆنی زبڵ دێ، هەست دەکەم ئەو شتومەکانەی لە دەوروبەری ئێمەدان و خراپ بوون و شکاون، هەر لەو شتانە دەچن کە دەبێ بۆنی زبڵیان لێوە بێ، تەنانەت ئەگەر وایش نەبێ و بۆنێکی تریان لێوە بێ.

لە خەیاڵی خۆم دا هەستم دەکرد، مردوەکە کڵاوی لە سەردایە. ئێستا ئەوەی لە بەر چاومە و دەیبینم بە پێچەوانەی خەیاڵەکەمە و سەری ڕووتە و هەر دەڵێی لە مێو ساز کراوە، پەڕۆیەکیان لە دەوری چەناگەی هاڵاندوە. دەمی تۆزێك کراوەتەوە و لە پشت لێوە شینهەڵگەڕاوەکانییەوە ددانە زەرد و ناڕێکەکانی دیارن. زمانە ئەستوور و لیچقنەکەی لە بەینی ددانەکانییەوە بە لا لەغاوەی دا شۆڕ بوەتەوە، لایەکی شەویلکەی لە ڕووخساری ڕەشتر دەنوێنێ. چاوە هەراسان و بێ ئارامەکانی لە چاوی مرۆڤی زیندوو زەقترن و پێستەی لەشی هەر لە خۆڵێکی شێدار دەچێ.

---

[1] جۆلانییەکی گەورەیە بۆ تێدا نووستنی گەورەکان هەڵی دەبەستن.

جاران وام دەزانی مردوو هەر وەك مرۆڤی نووستوو ئارام و لەسەرخۆیە، بەڵام ئێستا ئەوەی دەبینم تەواو بە پێچەوانەی ئەوەیە، کە پێشتر بیرم لێ دەکردەوە. ئەو ڕاست لەو مرۆڤە زیندوانە دەچێ، کە دوای شەڕ و هەڵا نێو چاوانیان تێك دەنێن و زۆر تووڕەوتووسن دەنوێنن.

ئەو جلوبەرگەی دایکم ئەمڕۆ لە بەری کردوە، لەگەڵ هەموو ڕۆژەکانی تریدا جیاوازیی هەیە. هەر دەڵێی ئەویش لێی گۆڕاوە و پێی وایە ئەمڕۆ کە یەکشەممەیە. کڵاوێکی حەسیریی کۆنەی لە سەر ناوە و هەتا سەر گوێچکەکانی دای داونەتەوە و کراسە ڕەشەکەیشی تەواو ملی داپۆشیوە و قۆڵی کراسەکەی هەتا نزیك پەنجەکانی داپۆشیوە.

لە بەر ئەوەی ئەمڕۆ کە چوارشەممەیە، ئەو زیاتر بۆ من هەر لە ژنێکی غەوارەی نەناسیاو دەچێ، کاتێك بابەگەورەم لە سەر کورسییەکە هەستا و چوو بە پێشوازیی ئەو پیاوانەی تەرمەکەیان هەڵگرتبوو دەیان هێنا، هەستم کرد دایکم دەیەوێ شتێکم پێ بڵێت. لە نزیك منەوە لە پاڵ دەرگا داخراوەکەوە دادەنیشتبوو. هەناسەی درێژ هەڵدەکێشێ و بەردەوام قژەکانی دەخات بە پشتدا و لە ژێر کڵاوەکەی دا کە بە پەلەپەل لە سەری نابوو، دەیان شارێتەوە. پیاوەکان وەك باوەگەورەم پێی گوتبوون تابووتەکەیان لە پەنای قەنەفەکە داناوە.

تابووتەکە خشت بە قەد تەرمی مردوەکە دەبوو... ئەو کاتەی پیاوەکان تابووتەکەیان دەبردە ژوورەکەوە، هەستم کرد دەبێ بۆ پیاوێك کە ئەو قەنەفەی پڕ کردوە، چکۆڵە بێ و جێی نەبێتەوە. هەر نەم دەزانی منیان لەبەر چی لەگەڵ خۆیان دا هێناوە، هەتا ئەمڕۆ پێم وا بوو هیچ کەسێك لە

نێو ئەم ماڵەدا نـاژی. مـاڵێکی گـەورەی دوو نەفشـە، بـاوەڕ ناکـەم هـەتا ئێستا تەنانەت بۆ کەرەتێکیش، دەرگاکەی کرابێتەوە.
بە درێژاییی تەمـەنم ئەوەنـدە دڵـم خـۆش نـەبوە، کـە دایکـم پێـی گـوتم: «ئەورۆ پاشنیوەڕۆ ناچییەوە بۆ قوتابخانە.» لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی تایبەت و جیاواز لە جاران ئەو قسەی پـێ گـوتم، پـاش ماوەیـەك ڕۆیشـتە ئـەو دیـوەی تـر و کۆتوشـەڵوارە سـەوزەکەمی هێنـا و بـە بـێ ئـەوەی وشەیەکیشی لە دەم بێتە دەرێ، لە بەری کـردم و بـەرەو دەرگـای دەرێ وە ڕێ کەوتین، هەتا لەگەڵ بابەگەورەمدا یەکتری گیر بین. بە بەردەکـەی ئەو سێ ماڵەی کەوتبوونە نێوان ماڵی ئێمە و ئەم ماڵەوە، تێپەڕین. بەڵێ، ئێستا ئـەوە بـە چـاوی خـوم دەبیـنم بەڕاسـتی هـیچ کەسێك لـەو ماڵـەدا نەدەژیا و ئەو کەسەی مردوە هەر ئەو کەسـەیەکە، دایکـم دەیگـوت: «لـە ڕێـوڕەسمی بەخاکسـپاردنی دوکتـۆردا دەبـێ وەك پیاوێـك ژیرانـە و بـە ئەدەب بجووڵێیتەوە.»
کاتێك چووینە ژوورەوە تەرمەکەمان نـەدی. سـەرەتا بابەگـەورەم لەگـەڵ پیاوەکاندا کەمێك قسەیان کرد و پاشان بە ئێمەی گـوت بڕۆنـە ژوورەوە. لەو کاتەدا پێم وا بوو کەسێك لە نێو ژوورەکـە دایـە، بـەڵام هـەر کـە لاقـم نایە نێـو دیوەکـەوە هەسـتم کـرد، دیـوێکی تاریـك و چـۆڵومۆڵە. هـەر لـە سەرەتاوە هەوایەکی شێدار بەرەو پیریمان هـات و هەسـتم بـە بـۆنی ئـەو زیلە کرد، بۆنێکی گووراو و ناخۆش و چەقبەستوو، ئەو بۆنە لە سەرەتا و ئێستایش، وەك هەوایەکی شێدارە و بە شێوەی شەپۆلان هێورهێور دێـت و دەتوێتەوە. دایکم دەستی گرتم و لەو دیوە تاریکەدا ڕێی پێ نیشان دام

و له قوژبنێکدا، له پەنای خۆیەوە دای نام. بەرەبەرە و پاش ماوەیەك هەستم بە بوونی چەند شتێك کرد. باوەگەورەم دیت بە دەوری پەنجەرەکەدا دەهات بیکاتەوە، هەر دەتگوت تایەکەی بە چوارچێوەکەیەوە گاڵە دراوە، پێوەی نووسابوو نەدەکرایەوە. بە گۆچانەکەی بە قوفڵەکانی دا دەکێشا و ئەو تەپوتۆزەی بە لێدانەکەی لێی هەڵدەستا لە کۆتەکەی دەنیشت.

سەرم بۆ ئەو لایە وەرچەرخاند، کە بابەگەورەم بەرەو ئەویێ دەڕۆیشت و دەیگوت ناتوانێ پەنجەرەکە بکاتەوە. لەو کاتەدا زانیم نەفەرێك لە سەر کورسییەکەیە، پیاوێکی سەرتاپا ڕەش، بێ ئەوەی بجووڵێتەوە، لەویێ ڕاکشا بوو. پاشان سەرم بەرەو دایکم وەرسووڕاند، کزکەی کردبوو مات و لەسەرخۆ دانیشتبوو، لە شوێنێکی نادیاری نێو وەتاغەکەی دەڕوانی. لەبەر ئەوەی لاقەکانم نەدەگەییشتنە سەر ئەرزەکە و بستێك بە حەواوە بوون، دەستەکانم خستە بن ڕانەکانم و بەری دەستم لە سەر کورسییەکە دانا و لاقەکانم خستە جۆلانێ و بەرەو پاش و بەرەو پێش ڕام دەژەندن. بیرم لە هیچ شتێك نەدەکردەوە، هەتا ئەوەی کەوتەوە بیرم، کە دایکم گوتبووی: «لە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی دوکتۆردا دەبێ بە ئەدەب بی.

تەزوویەکی سارد بە نێو شانم دا هات، کە ئاوڕم لە پشتە سەرم داوە، دیوارێکم دی، کە لە دار و تەختەی وشك و نارێك چاك کرابوو، بەلام دەتگوت کەسێك لە نێو دیوارەکەوە پێم دەڵێ: «لاقەکانت ڕا

مەوەشێنە... ئەو پیاوەی کە لە سەر قەنەفەکە ڕاکشاوە دوکتۆرە و عومری خودای کردوە.

ئەو جارە کە ئاوڕم داوە و دیتم وەك کەڕەتەکەی پێشوو نەبوو... ڕا نەکشابوو، بەڵکوو کۆچی دوایی کردبوو.

ئیتر لەوەو بەو لاوە، هەر چەندە هەوڵ دەدەم کە ئاوڕ لەو لایە نەدەمەوە، هەست دەکەم هێزێکی نادیار و شاراوە بە هەموو هێزی خۆی پاڵ بە ملمەوە دەنێ و بە زۆری سەرم بەرەو ئەو لایە وەردەسووڕێنێ. تەنانەت بە هەموو هێزی دەروونیی خۆم هەوڵ دەدەم چاو لە شوێنێکی تری نێو وەتاغەکە بکەم، بەڵام لە هەموو شوێنێك لەبەر چاوم ون نابێ و چاوەخڕەکانی و ئەو ڕووخساری کە ڕەنگی مردووی لێ نیشتوە، لە نێو تاریکییەکەیشدا هەر لە بەر چاومە.

چ شتێك بۆتە هۆکاری ئەوەی، کە هیچ کەسێك بۆ پرسە و تازییەکەی نەهاتوە نازانم... هەر ئێمە هاتووین. بابە گەورەم، دایکم و ئەو چوار سووڕپێستە گواجیرابییەی، کە کار بۆ بابەگەورەم دەکەن. پیاوەکان تەلیسێك قسڵیان هێنا و سەرەونخوونیان کردە نێو تابووتەکەوە. نازانم ئەمانە بۆ دەبێ ئەو قسڵە لە نێو ئەو تابووتەدا بڵاو بکەنەوە، کاتێك تەلیسەکە بە تاڵ بوو، یەکێك لە پیاوەکان تەلیسەکەی لە نێو تابووتەکەدا تەکاند و ئەو خۆڵ و تەپوتۆزەی بە تەلیسەکەیشەوە خووسابوو ڕژایە نێو تابووتەکەوە. دەست و لاقی مردوەکەیان گرت و لە ئەرزیان بڕی. مردوەکە کراسێکی بۆری لە بەر دایە و پانتۆڵێکی کۆنەی کەم بایەخ کە بە جێگای دۆخین بە پەتێکی پانی ڕەش بە نێو قەدییەوە

بەسترابوو، تەنیا لاقی چەپەی کەوشی تێدایە، بە وتەی ئادا[2] لاقێکیان شایە و لاقێکیان سواڵکەرە. کەوشی لاقە ڕاستەکەی لە سەر قەنەفەکە بە جیٚ مابوو.

مردوەکە هەتا لە سەر قەنەفەکە بوو، دەتگوت کۆڵێك غەمی لە سەر شانە، بەڵام لە نێو تابووتەکەدا هێور و لەسەرەخۆتر دەهاتە بەر چاو و ڕووخساری هەر لە ڕووخساری مرۆڤێك دەچیٚ، کە زەق و زیندوو و لەگەڵ کەسێکی تردا کێشە و دەمەقاڵەی بوە، ئێستا مات بوە و خەریکە فیکری لیٚ دەکاتەوە، کە لە لاتەنیشتەوە لێی دەڕوانی بە هەیبەت تر دێتە بەر چاو.

بابەگەورەم هەتا ئەم کاتە لە نێو وەتاغەکەدا هەر خەریکی گەڕان و پشکنین بوە، چەند شتێکی هەڵگرتوە و ناویەتە نێو تابووتەکەوە، دیسان چاو لە دایکم دەکەمەوە بەو هیوایەی کە پێم بڵیٚ لە بەر چی بابەگەورەم ئەو شتانە دەنێتە نێو ئەو تابووتەوە، بەڵام دایکم بەو کراسە ماتەیەوە، بیٚ جووڵەیە و دەڵێی هەموو هەوڵی ئەوەیە ئاگای لە خۆی بێت، تا چاو لەو لایە نەکات کە مردوەکەی لێیە. منیش دەمەویٚ ئەو کارە نەکەم، بەڵام هەر چی زۆری لە خۆم دەکەم، ناتوانم و چاو لە مردوەکە دەبڕم و زەق زەق لێی دەڕوانم. بابە گەورەم کتێبێك توور دەداتە نێو تابووتەکەوە. ئاماژە بە پیاوەکان دەکات و سیٚ کەسیان سەرپۆشی تابووتەکە دادەدەنەوە، لەم کاتەدا هەست دەکەم ئەو دەستە

---

[2] 'ada

بە هێزەی کە بەزۆری سەرمی بەرەو تابووتەکە وەرسووڕاندبوو، دەستم لێ هەڵدەگرێ و دەتوانم بە مەیلی خۆم و بە کاوەخۆ چاوێك بە دەوروپشتی خۆم دا بگێڕم.

دیسانەوە ئاوڕێك لە دایکم دەدەمەوە و چاوێکی تری لێ دەکەمەوە، بۆ یەکەمین کەڕەت لەو کاتەوەی هەنگاومان ناوەتە نێو ئەو وەتاغەوە ئاوڕم لێ داوەتەوە و بە بزەیەکی کاڵەوە لێم دەڕوانێ. بزەیەکە هەر چی بیری لێ دەکەمەوە هیچ مانەیەکم پێ نابەخشێت. دەنگی هۆڕژنی شەمەندەفەرێك لە دوورەوە دێ، کە دەگاتە سەر پێچەکە بەرەبەرە کاڵ دەبێتەوە و تەواو دەبێ. یەکێك لە پیاوەکان دەبینم لایەکی سەری تابووتەکە هەڵدەداتەوە و بابەگەورەم کەوشی مردوەکە، یانی ئەو کەوشەی پێشتر لە سەر قەنەفەکە بە جێ مابوو، دەخاتە نێو تابووتەکەوە. لە ناکاو بە مێشکم دا تێ دەپەڕێ، کە کاتژمێر دوووسی خولەکە، ئەوەم دێتەوە یاد، ئێستا سەروبەندی ئەوەیە، منداڵەکان لە نێو قوتابخانەدا ڕیز بن هەتا بە ڕێکوپێکی بچنە نێو پۆلەکانیانەوە و زەنگی یەکەمی عەسر دەست پێ دەکات.

لە بەر خۆمەوە دەڵێم: ئابراهام[٣] ...

£

£

---

[3] [٣]Abraham

نەدەبوو ئەم منداڵەمان لەگەڵ خۆمـان دا بهێنایـە، بینـینی ئـەم دیمەنـە لەگەڵ تەمەنی ئەودا ناگونجێت، تەنانەت بۆ منیش، کە ئەوە خەریکە پـێ دەنێمە سی ساڵەی تەمەنیشمەوە قورسە، چ بگات بـەو لالـەغاوە زەردە، ئەم هەوایە و بوونی ئەو مردوە بە یەکەوە خەریکە مرۆڤ بخنکێنن، پڕن لە ئازار و جەزرەبە.

بڵێی ڕزگار بین و لێرە بڕۆین... چۆن بە بـابم بڵـێم خەریکـە لـەم دیـوەدا دەخنکێم و هەر دەڵێی دەستیان لە ئەوکم ناوە. لە نێو ئەم وەتاغەدا کـە بۆ ماوەی حەڤدە ساڵ شتومەکی پیاوێکی تێدا بوە، کە هیچ هۆگرییـەکی پێیانەوە نەبوە. ڕەنگە بابم تـەنیا کەسـێك بووبێـت، کـە بـۆ ئـەم کابرایـە هەستی بە دڵسۆزی کردبێت و لەگـەڵی دا هـاودەردیی نوانـدبێ، هـەر ئـەو هاودەردییەیشـە ئێسـتا بۆتـە هـۆی ئـەوەی، بـابم نـەهێڵێت لـە نێـو ئـەم وەتاغەدا کرم تێی بدات و بڕزێت.

کاتێك چاوم بەم کارە بێهوودەیەی دەکەوێ، وەك خۆرە خۆم دەخۆمەوە و لە دەروونەوە دەهەژێم، ئەویش کاتێـك بـیر لـەو سـاتە دەکەمـەوە، کـە هەموومان وێکڕا لێرە دەچینە دەرێ و بە شوێن تابووتێکەوە پێ دەنێینە سەر شەقام، لە دەروونی هیچ یەکێك لەو کەسانەی دەمان بینن هەست بە هاودەردی ناکەم، بێجگـە لـەو شـادی و خۆشـییەی لـە دڵیـان دەگـەڕێ و سەرتاپای لەشیان دادەگرێت. بیر لە ڕووخساری ئەو ژنانە دەکەمەوە کـە لە پشت پەنجەرەی ماڵەکانەوە چاو لە باوکم دەبڕن، ئەو کاتـەی بـە بـەر دەرگای ماڵەکەیان دا تـێ دەپـەڕێ، چـاو لـە مـن دەکـەن کـە بـە خـۆم و منداڵەکەمەوە بە شوێن تابووتەکەوەم، ئەو تابووتەی پیاوێك خەریکە تێی

دا دەڕزێت. زۆر لە مێژ بوو هەموو خەڵکی ئەم شار ئاواتی مردنیان بۆ دەخواست و ئارەزوویان بوو ئەم ڕۆژە بە چاوی خۆیان ببینن، ئەوە ئێستا بە بەر شەپۆلی نەفرەت و قینی بێ کۆتاییاندا، تەنیا هەر سێ کەسی لەگەڵە و بەرەو گۆڕستان بە ڕێوەیە، لەوانەیە ئەم بڕیارەمان ببێتە هۆی ئەوەی لە داهاتوودا هیچ کەسێك ئامادە نەبێ لە بەخاکسپاردنی ئێمەیشدا بەشداری بکات و کوڵۆڵی و خراپیی ئەم کابرایە داوێنی ئێمەیش بگرێ.

لەوانەیشە هەر لە بەر ئەوە بێ، منداڵەکەم لەگەڵ خۆم دا هێنا، ئەو کاتەی بابم گوتی: «دەبێ لەگەڵ مندا بێن . یەکەمین شتێك بە مێشکم گەییشت ئەوە بوو، کە منداڵەکەیشم لەگەڵ خۆم دا بهێنم، هەتا هەست بە ئارامیی دەروونی بکەم. ئێستا ئێمە لێرە لەم ئێوارە چەقبەستوە و نەفەسبڕەی سێپتامبەرداین، وا هەست دەکەم ئەم شوێنەی تێی داین و ئەو ئامێرانەی لە دەوروپشتمان دان ئەوانیش وەك دوژمنە دڕندەکانمان لێمان دەڕوانن، هیچ شتێك نییە ببێتە هۆی دڵەکوتێ و نیگەرانیی بابم، ئەو هەموو تەمەنی خۆی بەو جۆرە کارانەوە بردۆتە سەرێ، خەڵکی ئەم شارەی بە دژی خۆی هان داوە، دابونەریتەکانی بە بێ دڵەڕاوکێ ناوەتە ژێر پێی و کردوونی بە قوربانیی ئەوەی هەتا بتوانێ بێبایەخترین بەڵێنەکانی خۆی بردبێتە سەرێ. بیستوپێنج ساڵ لەمەو بەر کە ئەو پیاوە پێی نایە ماڵی ئێمەوە، بە دڵنیاییەوە بابم ئەمەی باش دەزانی، کە لە ڕۆژێکی وەك ئەمڕۆدا هیچ کەسێك ئامادە نابێ، تەنانەت تەرمی ئەم کابرایەیشی لەگەڵ فڕێ بداتە بەر سەگ. لەوانەیە هەر ئەو کاتەیش بابم

تەواوی ئەم شتانەی لە بەرچاو گرتبیّ و ئێستا، پاش بیستوپێنج ساڵ، دەبیّ ئەوە بزانیّ ئەمە هەر ئەو کارە دژوارەیە، کە ماوەیەکی دوورودرێژ بیری لیّ کردۆتەوە. کارێکی ئەستەم و دژوارە کە سەرەنجام بە هەر دەردیسەرییەك بیّ، دەبوایە بە ڕێوەی بەرێت. هەر بەو هۆیەیشەوە ناچار بوو خۆی بە تەنیا لە نێو شەقامەکانی ماکاندۆدا بە شوێن تەرمەکە بکەویّ و بەرەو گۆڕستانی شاری بەرێت.

£

£

سەرەڕای ئەوانە کاتێك ئەو ڕۆژە گەییشتی، بابم ئەو ورە و ئازایییەی تێدا نەبوو، تا بە تەنیا شان بداتە بەر ئەو کارە و منی ناچار کرد، بەشداریی لەو بەڵێنە گلاوەی دا بکەم کە ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی من خۆم بناسم، ئەو لە ئەستۆی گرتبوو. کاتێك بە منی گوت: «دەبیّ تۆیش لەگەڵم دا بێیت.» هەر مۆڵەتی پیّ نەدام بیر لە قسەکەی بکەمەوە، هەتا بۆم ڕوون بێتەوە و بزانم بەشداریکردن لە ناشتنی تەرمی پیاوێکی ئاوادا، کە تەواوی خەڵکی ئەو شارە ئاواتیان دەخواست لە نێو ماڵەکەی دا برزێت و هەلاهەلا بێت، چەندە بێڕێزی و دزێویی لە خۆدا حەشار داوە. لە بەر ئەوەی خەڵك هەر بەوەندە ڕازی نەبوون، ئەوانە هەموویان لە ناخی دڵیانەوە ئارەزووی مردنیان بۆ دەخواست، بە بیّ ئەوەی تۆسقاڵێکیش هەست بە پەشیمانی بکەن. تەناتەت لە ناخی دڵیانەوە ئاواتیان ئەوە بوو، ئەو بۆنەیان بە سەردا بچێت، کە لە

هەپرووتبەهەپرووت بوون و داتولاتی لەشی ئەوەوە هەلدەستیّ. ئەو بۆنە بە هەر چواردەوری شاردا بلاو بێتەوە و بگەڕێ، بە بێ ئەوەی هیچ کەسێك لە جێی خۆی بجوولێت، یان هەست بە مەترسی بکات و پێی بەدنێو بێت، بەلکو بە دیتنی ئەو ساتەی، کە ماوەیەکی زۆر بوو بە دلّ و گیانەوە ئاواتیان بۆ دەخواست و چاوەڕوانی بوون، هەستیان بە خۆشی و شادی دەکرد و دەیانویست ئەو کارە درێژە بکێشێت، هەتا ئەو کاتەی گێڕانی ئەو تەرمە داڕزاوە بە نێو شاردا زامی هەموو دلەکانیان ساڕێژ بکات و ئاوری هەناویان دابمرکێنێتەوە ئۆخژنیان لە دەروون بگێڕێت.

ئێمە ئێستا لە کارێکدا بەشداری دەکەین و مەبەستمان ئەوەیە، ئەو شادی و خۆشییەیان لیّ تالّ بکەین، کە خەلکی ماکاندۆ سالیانێکی دوورودرێژ بوو چلەیان بۆ دەکێشا و چاوەڕوانی بوون، وا هەست دەکەم ئەو غەم و ئازارەی، ئێمە بە ئەنجامدانی ئەو کارە، لە سەر دلی خەلکی ئەم شارە دای دەنێین، لە بەر تووڕەیی و بێزاریمان نەبیّ، بەلکوو لەبەر دواخستنی هەلچوونی تووڕەیییەکەیانە، ئەوەیش بۆ خۆی هۆیەکی ترە بۆ ئەوەی، کە دەبوو ئەو مندالەمان لەگەلّ خۆمان دا نەهێنایێ و لە مالێ بە جێمان بهێشتایە، هەتا ئەویش لە پیلانێکەوە وەر نەدریّ کە ئێستا ئێمە لەگەلی دا ڕووبەڕوو بووینەتەوە و دوکتۆریش دە سالّ لەمەو بەر لەو کارەوە گلابوو. مندالەکە دەبوو لەو فێلّ و تەلەکانە وەر نەدرایە و دوورەپەرێز ڕابگیرایە، ئەو تەنانەت هەر نایشزانێ لە بەر چی هاتوە بۆ ئێرە، لە بەر چ هۆکارێك ئەومان هێناوە بۆ نێو ئەم ژوورە پڕ لە شتومەکەوە؟

بێدەنگ و کزومات دانیشتوە... دەستەکانی لە سەر قەنەفەکە داناوە و لاقەکانی ڕادەوەشێنێ و چاوەڕوانی کەسێکە ئەم مەتەڵە پڕ لە ترس و گرێ پوچکەی بۆ هەڵێنێ. دەتوانم لەوە دڵنیا بم، هیچ کەسێك ئەو دەرگا نادیارەی بۆ ناکاتەوە، ئەو دەرگا ئەفسووناوییەی وا ئیزنی پێ نادات هەتا لە هەرێمی هەست و سۆزی دەروونیی خۆی هەنگاوێك زیاتر هەڵبهێنێتەوە. چەند کەرەتێك ئاوڕی لە من داوەتەوە و دەزانم هەر دەڵێی یەکەمین جارە دەمبینێ و نام ناسێتەوە، هەر دەڵێی هەرگیز نەی بینیوم، هەتا بەو کراسە لووس و دەقدراوە و ئەم کڵاوە کۆن و شیتاڵشیتاڵە، کە لە سەرم ناوە، بەو غەم و دەردی کە لە دڵم دایە نەناسرێمەوە. ئەگەر مێمێ[4] ئێستا لە ژیاندا بمایە و لە نێو ئەمماڵەدا بژیایە، لەوانە بوو هەلومەرجەکە بە شێوەیەکی تر بوایە، لەوانە بوو خەڵکی پێیان وا بوایە من لە بەر خاتری ئەو هاتوومەتە ئێرە، هەتا لە غەمێکدا بەشداری بکەم کە ئەو هەر بایەخێکیشی بۆ دانەناوە، بەڵام ئەو دەیتوانی وا بنوێنێ و خەڵکی شاریش، هۆکارەکەیان چاك دەزانی.

یازدە ساڵێك لەمەو بەر مێمێ بێسەروشوێن بوو، مەرگی دوکتۆر سەرینی ئەرخەیانی نایە ژوور سەری ئەو کەسانەی چاوەڕوانی دیتنەوەی تەرمی مێمێ، یان لانی کەم ئێسکوپروسکەکەی بوون. مێمێ لێرە نەبوو، بەڵام ئەگەری ئەوە زۆر بوو، ئەگەر ئێستا لێرە بوایە، بە لایەنگریکردن لە

---

[4] ۴ meme

خـەڵکی شـار بـەرەنگاری پیاوێـك دەبـوەوە، کـە شـەش سـاڵی تـەواو ساردوسڕ وەك ئاژەڵێك لەگەڵی دا جووڵابوەوە.

£

£

لە دوورەوە دەنگی هۆرژەنی شـەمەندەفەر دەگاتـە گـوێم، پـێم وایە کاتژمێر دووونیوە و من لە بیری ئەوە دام، دەبێ لەم کاتـەدا خـەڵکی ماکاندۆ بە تەنگ ئەوەوە بن، کە بزانن ئێمە لەم کاتـەدا و لـەم ماڵـەدا بـە چییەوە خەریکین، دەکەومە یـادی ڕێبێکـا خـاتوون... بـەو لەشـە لاواز و ڕووخســارە غــەمبار و وێنــە تارمــایی ئاســایەی کــە بــە مــیرات لــە پێشینیانییەوە پێی گەییشتوە، لە پەنای باوەشێنە کارەبابییەکەی خۆی دا دانیشــتوە و ســێبەری پــەردەکانی پەنجەرەکــەی، ڕووخســاریان داپۆشیوە. بە بزربوونی شەمەندەفەرەکە کە لە کلکەی ڕێگاکەوە لە چاو ون دەبـێ، سـەری بـە لای باوەشـێنەکەدا شـۆڕ دەکاتـەوە، شـاپەڕەکانی دڵی، وەکـوو پـەڕەکانی باوەشـێنەکە هـەڵ دەخـولێن و لـە بـەر خۆیـەوە دەڵـێ: «لـە تـەواوی ئـەم کارانـەدا شـوێنپێیەکانی ئەهریمـەن بـەر چـاو دەکـەون.» هــەر وا کــە وەك زەروو بــە ڕیشــاڵی شــتە چــکۆڵە و بــێ بایەخەکانەوە بە بەرۆکی ژیاندا نووساوە، لەرز و چەقوچۆ ئازای ئەنـدامی دادەگرێ.

ئاگویدا[5] چاوی بڕیوەتە سۆلیتای[6] کەمئەندام کە لە دوای بەڕێکردنی دڵدارەکەی لە وێستگەی شەمەندەفەرەوە دەگەڕێتەوە، لێیەوە دیارە هەر کە هەنگاو دەنێتە کۆڵانە چۆڵەکەوە، چەترەکەی هەڵدەدات و دەیکاتە سێبەری سەری، دەنگی پێڵاوەکانی دەگاتە گوێچکەی، هەست و سۆزی ئەویندارىان لێ دەڕژێت، ئەو هەست و سۆزەی ڕۆژگارێك بەربینی بە خۆیشی گرتبوو، ئێستا جێگای خۆی داوە بە نەخۆشیی دینداری. بە شێوەیەکە ناچار دەبێ بە خۆی بڵێ: «وەك ئەو بەرازەی لە نێو کونەکەی دا خۆی دەگەوزێنێ، تۆیش لە نێو جێوبانەکەت دا ئەم شانەوشان دەکەی و خۆت دەگەوزێنی.

ئەو فیکر و خەیاڵە دەستم لێ هەڵ ناگرێ و ئەوکم بەر نادات، بڵێی هەتا کەنگێ من هەر پێم وابێ... کاتژمێر دووونیوە؟

ئەو کاتەی هێسترەکە بە بارەکەیەوە بە نێو هەورێك لە تەپوتۆزدا وێرغەی دەکرد، ئەو پیاوانەی خەوی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی چوارشەممەیان لە چاوی خۆیان حەرام کردبوو، چووبوون بەرەو پیری، تا پاکەتی ڕۆژنامەکانی لێ وەرگرن. باوە ئانخێل خەریك بوو خەوەنووچکە دەیبردەوە، پەرتووکی نزاکانی لە سەر کۆشە چەورەکەی دانا بوو لە دیوی جلوبەرگگۆڕینەکەی دا دانیشتبوو... گوێی بۆ دەنگی سمی ناڵی هێسترەکە هەڵخستبوو، ئەو مێشانەی لە خۆی دەردەکرد، کە خەویان لە

---

[5] ᵒagueda

[6] solita

چاوەکانی تاراندبوو، بە دەم قرقێنەدانەوە دەڵێ: «ئەو کفتانەی تۆ نەخۆشیان خستم!

بابم هیچ گرینگییەك بەم ڕووداوانە نادا و دەڵێی مێشێکیشی لێ میوان نییە، تەنانەت هەتا ئەو ڕادەیەی کە بەو پیاوانە دەڵێ، دەرگای تابووتەکە هەڵدەنەوە هەتا ئەو لنگەکەوشەی لە سەر قەنەفەکەی بە جێ مابوو بخەینەوە نێو تابووتەکەی. هەر ئەوە توانیویەتی هۆگری ئەو پیاوە قرنیسە بێ. ئەگەر ئەو کاتەی بەو تابووتەوە بە شوێن تەرمی ئەم پیاوە قرنیسە لە ماڵێ بچینە دەرێ و هەموو زبڵوزاڵ و گەندوگووژاڵی ئەو شارەمان، کە شەوی پێشوو کۆیان کردۆتەوە بە سەردا بکەن، لەبەر ئەوەی بە دژی ویستی دەروونیی ئەو خەڵکە جووڵاوینەتەوە بە قەدەر نووکە دەرزییەکیش چییە، تووشی سەرسووڕمانم ناکات.

لەوانەیە شەرمی بابم بیانگرێ و ئەو کارانە نەکەن و، بۆی هەیە لە ڕووی ئەو نەپرنگێنەوە و ئەو کارەیش بکەن، ئاخر بێبەشکردنی ئەو خەڵکە لەو تاموچێژەی بەو کارە وە دەستیان دەکەوت، کارێکی ئەستەمە و شتێکی هەر وا سووکوئاسان نییە. دوای ئەو هەموو پێشنیوەڕۆ گەرم و شێدارانەی، ئەو خەڵکانە بە لای ئەو ماڵەدا ڕۆیشتبوون و لە بەر خۆیانەوە گوتبوویان: «ئاخرییەکەی ئەو ڕۆژە دێ کە بە هەڵمژینی بۆنی تەرمەکەی شادی و خۆشیمان لە دڵ بگەڕێ!» ئەوە ویست و ئارەزوویەك بوو، کە هەموویان، لە گەورەوە هەتا چکۆڵە بە دڵ ئاواتیان بۆ دەخواست.

ماوەیەکی تر کە کاتژمێرەکە دەگاتە سێ، کچەکە بۆ خۆی هەموو شتێکی بۆ ڕوون دەبێتەوە. ڕێبێکا دەبینێ و هەرای لێ دەکات، لە پشت تۆڕی پەنجەرەکەوە بەڕوونی لێی دیار نییە، بۆ ماوەیەك لە بەر بای باوەشێنەکە لا دەچێ و پێی دەڵێ. «کیژۆڵە خاتوونەکە، ئەوە کاری ئەهریمەنە! . ڕۆژی دوای ئەوەی دەچێتەوە بۆ قوتابخانە کوڕەکەی من نییە، بەڵکوو کوڕێکی ترە، تەواو منداڵێکی ترە، جیاوازە لەوەی ئەمڕۆ، منداڵێك کە گەورە دەبێ و تۆرمەی لێ دەکەوێتەوە و سەرەنجام دەمرێ، بە بێ ئەوەی هیچ کەسێك ڕێزی لێ بگرێ و پێی وەفادار بێ و بە پێی دابونەریتی مەسیحییەکان، ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی بۆ بە ڕێوە بەرێ.

£

£

ئەگەر بیستوپێنج ساڵ لەمەو بەر ئەم پیاوە بە تکای کەسێك دەرگای ماڵی ئێمەی بە ڕوودا نەکرایەتەوە، (هیچ کەسێك تەقەلای ئەوەی نەدا بزانێت ئەم پیاوە لە کوێوە هاتوە.) ئەگەر لە لای ئێمە نەمایەتەوە و دەستی نەکردبایە بە گژوگیا خواردن و بەو چاوانەیەوە کە هەر لە چاوی کێوی دەچوون وەکوو سەگێکی زەنەك چاوی نەبڕیایەتە ژنانەوە، لەوانە بوو ئێستا من لە ماڵی خۆمان بە ئەرخەیانی و ئاسوودەیی بۆی دانیشتبام، بەڵام ئەم ئازار و دەردەسەرییەی من چارەنووسێك بوو، کە بەر لەوەی هەنگاو بنێمە سەر خاك، بە قەڵەمی دەستێکی نادیار لە نێو چاوانم نووسرابوو، ئەم ڕازە هەتا ئێستا بە شاراوەیی ماوەتەوە، هەتا

ئەم ساڵە شوومەی من دەگەمە تەمەنی سیساڵی و بێت و وەك باشوو بە سەر شانمەوە بنیشێتەوە و بابم پێم بڵێت! «دەبێ لەگەڵ مندا بێت...
پاشانیش بەر لەوەی دەرفەتی ئەوەم هەبێ پرسیارێکی لێ بکەم، گۆچانەکەی دەستی لە ئەرزەکە کوتا و گوتی: «دەبێ ئەو قەیرانەیش چارەسەر بکەین کچم، دوکتۆر ئەمڕۆ بەیانی خۆی خنکاندوە.
پیاوەکان ڕۆیشتن و چەکووشێك و بەستەیەك بزماریان لەگەڵ خۆیان دا هێنا، ئەوان تابووتەکەیان بزماڕێژ نەکرد، شتەکانیان لە سەر کورسییەکە دانا و بۆ خۆیشیان لە سەر ئەو قەنەفەی مردوەکەی لە سەر بوو دانیشتن، بابەگەورەم لەسەرەخۆ و ئارام دەهاتە بەر چاو، بەڵام ئەوەندی ئەو لەسەرەخۆیە ئەوەندەیش پەرێشانی و بێهیوایی دەخاتە دڵی ئێمەوە، ئارامییەکەی وەك ئارامیی مردووی نێو تابووتەکە نییە، ئەو ئارامییەی ئەو، زیاتر لە کەسێکی پەرێشان دەچێ، کە بیەوێ ددان بە جەرگی دا بنێ، هەتا ئەوانەی دەوروبەری هەست بە نیگەرانییەکەی نەکەن و لە ترسی ئەوان ئازارەکانی دەروونی بشارێتەوە، دەنا لە دەروونەوە وەك مەنجەڵ دەکوڵێ. تەنیا بابەگەورەم لەسەرەخۆ و وردەوردە بە شەلەشەل بە نێو وەتاغەکەدا دێت و دەچێ و ئەو کەلوپەلانەی بە نێو دیوەکەدا پرشوبڵاو ببوونەوە کۆیان دەکاتەوە و ڕێکوپێکیان دەکات.
نێو وەتاغەکە پڕ بوە لە مێش، کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە، کە نێو تابووتەکەیش پڕ دەبێ لە مێش، هەموو گیانم مووچڕکی پێدا دێ. هەتا ئێستا تابووتەکەیان بزمارڕێژ نەکردوە، هەتا سەرەکەی جوان کپ بێ،

بەڵام دەڵێی ئەو گیزەگیزەی لە سەرەتاوە هەستم پێ کردبوو، دەنگی باوەشێنە کارەباییەکەی دراوسێکەمان بوو، لە شالاّوی ئەو مێشانە دەچێ، کە خۆیان بە تابووتەکە و بە سەروچاوی پیاوەکاندا دەکێشن، سەرێك ڕادەوەشێنم، چاوەکانم لە سەر یەك دادەنێم، بابم دەبینم کە سەری چەمەدانێك لا دەبا و هەندێك شتومەکی لێ دەردێنێ، کە من نازانم چین. لە سەر قەنەفەکە ئاوری چوار سیغار دەبینم، بەڵام ئەو پیاوانەی سیغارەکانیان داگیرساندوە، نایان بینم و دیار نین. من کە لەم گەرما تاقەتپڕوکێنەدا، لەم ساتە ئەستەمە چەقبەستوەدا و لە نێو ئەم گیزەگیزەی مێشانەدا گیرم خواردوە، هەست دەکەم دەڵێی کەسێك بە سرتە پێم دەڵێ: «ئەوە داهاتووی تۆیە... تۆیش دەنێینە نێو تابووتێکی پڕ لە مێشەوە، هێشتا بڕێکت ماوە ببیتە یازدە ساڵ، بەڵام ڕۆژێك تۆیش دەگەیتە ئەم چارەنووسەت... تۆیش لە نێو تابووتێك دەنێن و سەرەکەی گاڵە دەدەن و هەتا ئەبەد بە تەنیا بە جێت دەهێڵن.

لاقەکانم لە پەنای یەکدا جووت دەکەم و بیر لەوانە دەکەمەوە، چاو لە چەکمە ڕەشە بریقەدارەکانم دەبڕم، هەست دەکەم قەیتانی تاکێکیان کراوەتەوە، دیسانەوە چاو لە دایکم دەکەمەوە، ئەویش چاو لە من دەکات و دادەنەوێتەوە، هەتا قەیتانی پۆتینەکانم بۆ گرێ بداتەوە، ئەو هالاّوەی لە سەر سەری دایکمەوە هەڵدەستێ، بۆنی چێشتخانە و بۆنی داری کورسیی لێ دێت، دیسانەوە دەمخاتەوە بیری تابووتەکە... ناتوانم بە جوانی هەناسە هەڵ بکێشم، دەمەوێ لێرە بچمە دەرێ، دەمەوێ لە هەوای گەرمی سەر شەقامەکەدا هەناسە هەڵ بکێشم و دوایین ڕێگا تاقی

بکەمەوە، دایکم هەڵدەستێتە سەر پێ و بە سرتە پێی دەڵێم: «دایە...
!

بە بزەیەکەوە وەڵامم دەداتەوە و دەڵێ: «بەڵێ؟

دادەنەوم و دەمم دەنێم بە گوێچکەیەوە، ڕووخساری پڕە لە بێدەنگی و هەست دەکەم سەری وەك پۆلوە ئاور تینی لێ هەڵدەستێ، بە ترس و لەرزەوە، دەڵێم: «دەمەوێ بچمە دەرێ.

دایکم، بانگ لە بابەگەورەم دەکات، شتێك بە گوێچکەی دا دەچرپێنێ، کاتێك دێتەوە لام دەڵێ: «شتی وا نابێ، ئێستا مەحاڵە .

چاوە چکۆلە و زەقەکانی لە پشتی شووشەی چاویلکەکانییەوە دەبینم، هەر دەڵێی مێشێکیشی لێ میوان نییە، خۆم ڕادەژێم و بێ دەنگ لە سەر جێگاکەم دادەنیشم، بەڵام دیسان کارەکان سەبرسەبر دەچنە پێشێ، وەك ماری سەر سکڵ گینگڵ دەدەم، جارێکی تر و دیسان جارێکی تر گینگڵ دەدەم، دایکم دیسان سەری دەنێ بە گوێمەوە، بە سرتە پێم دەڵێ: «چاکتر نەبووی؟

ئەم جارەیان دەنگێکی پتەو و نێرانە لە گەرووییەوە دێتە دەرێ، دەڵێی ژێی دەنگەکەی زیاتر لە سەرکۆنەکردن دەچێ هەتا پرسیار لێ کردن.

زگم وەك بەرد ڕەق بوە، بەڵام پرسیارەکەی دایکم خاوی دەکاتەوە، هەست بە هێمنی و لە سەرەخۆیی دەکەم و پاشان هەموو شتێك، تەنانەت دڵسۆزییەکەی ئەویشم لە دڵ گران دێ و پێی دەڵێم: «نا، هێشتا هەر وەك خۆم وام.» زگم توند دەکەم و هەوڵ دەدەم لاقەکانم بە ئەرزەکەدا بکێشم، (ئەوەیش بۆ خۆی ڕێگاچارەیەکە) بەڵام ژێر پێم

بەتاڵە و لاقەکانم لە بۆشاییەکەدا سەما دەکەن، ئەو بۆشاییەی لە مابەینی من و تەرکی وەتاغەکە دایە.
کەسێك دێتە ژوورەوە، یەکێ لە پیاوەکانی بابەگەورەمە، بە دوای ئەودا پۆلیسێك و پیاوێك کە شەڵوارێکی جینیی سەوزی لە پێ دایە، دێتە ژوورەوە. پیاوەکە قایشێکی لە پشت بەستوە و دەمانچەیەکی پێوە هەڵواسیوە و کڵاوێکی خڕی دەورگیراوی بە دەستەوەیە. ئەو پیاوەی کە شەڵوارێکی سەوزی لە بەر دایە لە نێو تاریکییەکەدا دەکۆخێت، شتێك بە باوەگەورەم دەڵێ، دیسانەوە دەکۆخێ و بە دەم کۆخینەکەیەوە فەرمان بە پۆلیسەکە دەدا، کە پەنجەرەکە بکاتەوە.
دیوارە دارینەکان لە ڕواڵەتدا بێ گیان و لاوازن، دەڵێی لە خۆڵەمێش ساز کراون، کاتێك پۆلیسەکە بە قۆناغی تفەنگەکەی لە گیرەی پەنجەرە دەسرەوێنێ، هەست دەکەم ئەوەی دەکرێتەوە پەنجەرەکە نییە، بەڵکوو ئەوە دارودیواری ماڵەکەیە وێران دەکرێ و هەرەس دێنێ، بەڵام بێ گرمەوهەرا، وەکوو قەلایەکی خۆڵەمێشی کە بە دەم گەردەلوولەوە تێك دەتەپێ. هەست دەکەم هەر جارێکی تر تێی بسرەوێنێ فڕێ دەدرێمە ناوەڕاستی شەقامەکەوە، لە بەر تیرێژی هەتاودا دانیشتووین و هەموو گیانمان تەپوتۆز دای پۆشیوە، کاتێك بۆ دووهەمین کەڕەت لە پەنجەرەکە ڕادەکێشێ، تایەکەی دەکرێتەوە و شەپۆلێك پرشنگ دەڕژێتە نێو وەتاغەکەوە، تایەکەی بە جیڕەجیڕ بەرەو نێو وەتاغەکە دەکرێتەوە، وەك ئەو کاتەی دەرگای قەفەزێك بە ڕووی ئاژەڵێکی سەرگەرداندا دەکرێتەوە. بێدەنگ سەر دەکێشێتە ژوورەوە و بۆن دەکات، تووڕەیە و

چنگ لە دار و دیوارەکەی گیر دەکات و کەف هەڵ دەخرێنێ و پاشان دەچێتە شوێنێکی فێنکی قەفەزەکەی، هەتا هەندێك ئارام بێتەوە.
لەگەڵ کردنەوەی پەنجەرەکە، هەموو شتێك ڕەنگی دەگۆڕێ، بەڵام شێوازی نالەبار و نارێکی کەلوپەلەکە وەکو خۆیان دەمێننەوە، پاشان دایکم پڕ بە سییەکانی هەناسەیەك هەڵدەمژێ و دەستم دەگرێ و دەڵێ: «وەرە با لە پەنجەرەکەوە چاوێك لە ماڵی خۆمان بکەین.»
ئەم جارەیش دیسان شاردەبینمەوە، دەڵێی پاش سەفەرێکی دوور گەڕاومەتەوە ئێرە، ماڵەکەی خۆمان دەبینم، بێدەنگ و مات و چکۆڵە، بەڵام بن سێبەری داربادامەکان هەر فێنك و خۆش و دڵبلاوێنە. لە دوورەوە هەست دەکەم کە هەرگیز لە نێو ئەو فێنکاییيە سەوز و دلگیرەدا نەبووم، دەڵێی ماڵەکەی خۆمان، ماڵێکی خەیاڵی بوە و دایکم لەو شەوانەدا کە خەونی هاشەوپاشەم دەدیت و ڕادەچەنیم لە چیرۆکێکدا بۆی گێڕاومەتەوە و بەڵێنی دیتنی ئەو خانوەی پێ داوم.
پێپێی کوڕی دراوسێکەمان دەبینم، چۆتە ماڵی فیکرەوە، بێ ئەوەی ئێمە ببینێت بە دەم فیکەلێدانەوە بە لاماندا تێ دەپەڕێ. گۆڕاوە، دەڵێی هەر ئێستا چۆتە ئارایشگا و قژەسەری کورت کردۆتەوە.
سەرۆکی شارەوانی هەڵدەستێتە سەر پێ، دوگمەکانی کراسەکەی کراونەتەوە، سەروچاوی لە ئارەقەدا خووساوە... تووڕەیە، لێم دێتە پێشێ، لە بەر ئەو هەراوهوریا و کێشمەکێشمەی خۆی وە ڕێی خستوە، دەنگی دەرنایەت، دەڵێ: «هەتا ئەو کاتەی لە تەوژمی ئەو بۆنە کەم نەبێتەوە، لە مردنەکەی ئەرخەیان نابم.» پاشان دوگمەکانی کراسەکەی

دادەخات و سیغارێك دادەگیرسێنێ. دیسان ئاوڕ لە تابووتەکە دەداتەوە، لەوانەیە ئێستا بیر لەوە بکاتەوە ئیتر کەس ناتوانێ بڵێ کارەکە بە شێوەیەکی یاسایی بە ڕێوە نەچوە، تەماشای قووڵایی چاوەکانی دەکەم، هەست دەکەم ئەوەندە بە سەرنجەوە چاوم تێ بڕیوە، کە پێی وابێ من دەتوانم بزانم ئێستا چی لە مێشکی دایە. پێی دەڵێم. «تۆ هەر لەبەر ئەوەی دڵی کەس لە خۆت نەڕەنجێ، بە پێچەوانەی یاسا دەجووڵێتەوە.» ئەویش وەك ئەوەی بڵێ هەر ڕاست چاوەڕوانی ئەو قسە بووم، وەڵام دەداتەوە: «سەرهەنگ تۆ پیاوێکی بەڕێز و دونیادیتووی، دەیشزانی کە من لە چوارچێوەی دەسەڵاتی یاسایی خۆم دا دەجووڵێمەوە.» پێی دەڵێم «تۆ لە هەموو کەس چاکتر دەزانی، کە ئەو پیاوە مردوە.»

ئەو دیسان لە وەڵامدا دەڵێت «تۆ ڕاست دەکەی، من نۆکەری حکومەتم، باشترین کار ئەوەیە لە ڕێگای یاساییەوە نامەی مردنەکەی بنووسرێ.»

لە وەڵامی قسەکەی دا دەڵێم «ئەگەر یاسا بە دەست تۆیە، باشتر وایە بچیت و دوکتۆرێك بهێنی هەتا نامەی یاساییمان بۆ بنووسێت.

ئەویش بە بێ ئەوەی تۆسقاڵێکیش شلوێ بێ و بێ ئەوە هەست بەلاوازی و دوودڵی بکات، زۆر نەترسانە سنگ دەردەپەڕێنێ و چاو لە چاوم دەبڕێ و دەڵێ: «تۆ پیاوێکی دونیادیدە و بەڕێزی و بۆ خۆیشت ئاگاداری کە ئەم کارە کەڵکی نابەجێ وەرگرتنە لە دەسەڵات.

بە بیستنی ئەو وەڵامە تێ دەگەم شەراب گەوجی نەکردوە، بەڵکو ترس شلەژاندوویەتی.

£

£

ئێستا بەو ئاکامە گەییشتووم، کە سەرۆك شارەوانییش وەك تەواوی خەڵکی ئەم شارە لەو پیاوە داغدار و توورەیە، ئەوە هەستێکە ماوەی دە ساڵە لێرە بیچمی گرتوە و تێکەڵ بە هەست و بیری هەموو کەس بوە، یانی لەو شەوە درێژەی کە برینداره‌کانیان هێنا بەر دەرگای ئەم پیاوە و هاواریان کرد (لە بەر ئەوەی دەرگاکەی نەدەکردەوە و لە نێو ماڵەکەوە قسەی دەکرد) هەرایان لێ دەکرد!

«دوکتۆر ئەو بریندارانەمان بۆ دەرمان بکە، بێجگە لە تۆ دوکتۆری ترمان دەست ناکەوێ.» چونکە ئەو دەرگاکەی نەدەکردەوە و (دەرگاکەیشی لە ژوورەوە بە کلیل داخستبوو، برینداره‌کانیشیان لە بەر دەرگاکەدا ڕاکێشابوون.) هاواریان لێ دەکرد: «بێجگە لە تۆ دوکتۆری تر نییە، تکایە پیاوی چاك بە، لە ڕێی خودادا یارمەتیمان بدە، خێرت دەگاتێ» کەچی (لەو کاتە هەستیار و ئەستەمەیشدا ئامادە نەبوو دەرگاکەیان لێ بکاتەوە و یارمەتییان بدات.) لەو کاتەدا خەڵکەکە پێیان وابوو ئێستا ئەو لە ناوەڕاستی وەتاغەکەی دا ڕاوەستاوە و چراکەی لە سەر سەری ڕاگرتوە و چاوەزەرد و بێ بەزەییەکانی دەبریسکێنەوە، تەنیا لە وەڵامی

خەڵکەکەدا هەر ئەوەندەی گوت: «ئەوەی لەو بابەتەوە دەمزانی هەمووم لە بیر چۆتەوە، هەڵیان بگرن و بیانبەن بۆ شوێنێکی تر.

ئیتر دەرگاکە هەر وا بە داخراوی مایەوە (لە بەر ئەوەی لەوە بەو لاوە هەرگیزاوهەگیز ئەو دەرگایە بە ڕووی کەسدا نەکرایەوە) لە هەلومەرجێکی ئاوادا بوو کە تووڕەیی و بێزاری خەڵکەکە بیچمی گرت و گەییشتە چڵەپۆپەی خۆی. ئەم تووڕەییيە وەك پەتایەکی گشتی پەرەی سەند و هەتا کۆتاییی تەمەن، دەستی لە یەخەی ماکاندۆ بەر نەدا.

دە ساڵ بە سەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی، بێ ئەوەی قومێك لە ئاوی ئەو شارە بخواتەوە. لەبەر ئەوەی لە دەرمانخوارد کردن دەترسا، خواردنەکەیشی هەر ئەو سەوزیانە بوو کە لەگەڵ خزمەتکارە سووربێستەکەی لە نێو باخچەی حەوشەکەیان دا دەیانکرد. ئێستا خەڵکی شاریش هەستیان دەکرد، کاتی ئەوە هاتوە تۆڵەی خۆیانی لێ بکەنەوە و کولۆیەك لە جێی بەردەکەی ئەو شەوەی ئەو دابنێن. خەڵکی ماکاندۆیش، کە لە مردنی ئەو ئاگادارن، لەبەر ئەوەی ئەو بەیانییە بە دڵنیاییيەوە هەموویان بە دڵێکی ئاسوودەتر و ڕۆحێکی سووکترەوە لە خەو هەستاون. ئێستا خەریکن خۆیان ساز دەکەن هەتا بچن بەرەو پیری ئەو شادی و خۆشییەی ماوەی دە ساڵە چاوەڕوانیی هاتنین و بە ماف ڕەوای خۆیانی دەزانن و پێیان وایە، شیاوی ئەو مافەیشن. تەنیا ئاواتی ئەوان، ڕزین و داتولانی ئەو لەشە و هەڵلووشینی بۆنەکەیەتی لە پشت ئەو دەرگایەوەیە، کە ئەو شەوە سەرەڕای ئەو هەموو تکا و پاڕانەوەیە ئەو لێی نەکردنەوە.

£

£

ئێستا بەتەواوی هاتوومەتە سەر ئەو بڕوایەی، ئەگەر بیشکەومە بەر شالاوی توندوتیژی و توورەیی خەڵکی شار و لە لایەن ئەوانەوە بە بێزاری و نەفرەتیشەوە گەمارۆ بدرێم، ئەستەمە لەو بەڵێنەی بەم کابرایەم داوە پاشگەز ببمەوە و بە هیچ کولۆجێك، ئەگەر بە قیمەتی گیانیشم بێ خۆی لی نابوێرم، تەنانەت کڵێسایش ڕێگایەکی دیوەتەوە، هەتا ببێتە لەمپەر لە سەر ڕێگای بەڵێنەکەی مندا. باوە ئانخل چەند ساتێك لەمەو بەر پێی گوتم: «ناتوانم مۆڵەتی ئەوە بدەم هەتا لە نێو ئەو خاکە پاك و پیرۆزەدا تەرمی مرۆڤێك بنێژن، لە پاش شەست ساڵ ژیان، بێ ئەمریی خودای کردوە و خۆی لە دار داوە... ئەگەر تۆیش خۆت لەو کارە دزێوە ببوێری و نەیکەیت، سەرەڕای ئەوەی ئەم کارە هیچ خێرێکی بۆ تۆ تێدا نییە، خودات لێ ڕازی دەبێ.

منیش لە وەڵامی ئەودا گوتم: «بەخاکسپاردنی مرۆڤەکان، وەك لە کتێبی پیرۆزدا هاتوە، کارێکی خێرخوازانە و مرۆڤدۆستانەیە و یاسا ئایینییەکان ڕێزی بۆ دادەنێن.

دیسان باوە ئانخل گوتی: «بەڵێ، بەڵام لە بابەت ئەم پیاوەوە، ئێمە هیچ ئەرکێکمان لە سەرشان نییە، ئەوە ئەرکی سەر شانی کارمەندانی ئیدارەی تەندروستییە.

بۆ خۆم هاتم و ئەو چوار سوورپێستەی لە ماڵەکەم دا گەورە ببوون، لەگەڵ خۆم دا هێنامن، ئیزابێلی کچیشم ناچار کرد کە لەگەڵم بێ، هەر

لەبەر ئەوەیە، کارەکە زیاتر دەبێتە کارێکی بنەماڵەیی و ئینسانی، ئەوە لە حاڵێکدا، ئەگەر هەر بە تەنیا خۆم ئەو تەرمەم بە نێو شەقامەکانی شاردا و بەرەو گۆرستان ببردایە، زیاتر دەبوە کارێکی تاکەکەسی و ئاژاوەگێڕانە، بەڵام ئەگەر لەبەر ئەوەی من مرۆڤێکی پیرم و سەرهەنگی کۆماریشم، سەرەڕای ئەوانە، لە بەر ئەوەی لە لایەنی جەستەییەوە لاوازم، بەڵام خاوەنی دەروونێکی خاوێنم و هیچم لە دڵ دانییە، ئەوان با بە شیاوی ئەوەیشم نەزانن ڕێزم لێ بگرن، هیوادارم لانی کەم ڕێز لە کچەکەم بگرن کە ئافرەتێکە، من ئەو کارە لە بەر خۆم ناکەم، لەوانەیە لە بەر ڕۆحی مردوەکەیش نەبێ، تەنیا دەمەوێ ئەو بەڵێنە پیرۆزەم بەرمە سەر. ئەگەر کچەکەم لەگەڵ خۆم دا هێناوە، لە بەرئەوە نییە لە کەسانێك دەترسێم، بەڵکوو لە بەرنیەتی خێرخوازانەم بوە، ئەویش منداڵەکەی لەگەڵ خۆی دا هێناوە و ئێستا ئەوە سێبەسێ لێرەین.

هەر سێکمان، سێبەسێیش باری ئەو ڕووداوە تاڵەمان لە کۆڵ ناوە.

چەند ساتێك لەمەو بەر کە هاتینە ئێرە، پێم وا بوو تەرمەکە هێشتا هەر بە بنمیچەکەوە هەڵواسراوە، بەڵام ئەو پیاوانەی بەر لە ئێمە هاتبوونە ئێرە، دایانگرتبوو لە سەر قەنەفەکە ڕایان کێشابوو، ئەوان پێیان وا بوو ئەم کارە زۆر درێژە ناکێشێ و هەر لە بەر ئەوەیش، دەستوبرد کفنشیان کردبوو.

کاتێك دێمە ژوورەوە چاوەڕوان بووم تابووتەکە بێنن، کچەکەم و نەوەکەم لە قوژبنێکدا دانیشتوون و من خەریکی پشکنینی نێو ماڵەکەم، بەو هیوایەی دوکتۆر شتێکی لە پاش خۆی بە جێ هێشتبێ، هەتا ببێتە

بەڵگەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو کارەی کردوویەتی، چەکمەجەی مێزەکەی ئاواڵەیە و پڕە لە کوتە کاغەز... هیچیان دەستوخەتی ئەو نین، لە سەر مێزەکە ئەو سوێندنامەیەی لە بەرگ گیراوە، دەبینم کە بیستوپێنج ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ خۆی هێنایە ماڵەکەی منەوە. کاتێك دەرگای ئەو یەخدانە گەورەی کردەوە. ئەو یەخدانەی کە جێگای جلوبەرگی هەموو خێزانی بنەماڵەکەی منی تێدا دەبوەوە، بەلام هیچ شتێکی بێجگە لە دوو کراسی شڕۆڵ و بێ بایەخ، دەستێك ددانی دەستکرد کە بە دڵنیاییەوە هی خۆی نەبوون (لەبەر ئەوەی ددانەکانی خۆی ساخ و سەلیم و ڕێکوپێك بوون و دەتگوت سەدەفن.) کاغەزە پواو و تۆزاوییەکانی لە خوارەوە، لە چەکمەجەکەی ژێرەوەدا دانابوو، هەر هەمان ئەو ددانە دەستکردانەی کە بیستوپێنج ساڵ لەمەو بەر لەگەڵ خۆی هێنابوونی، ئەوانیش بە هۆی تێپەڕبوونی زەمان و لە بەر کەڵك لێوەرنەگرتنیان، تەپوتۆزاوی ببوون و زەرد هەڵگەڕابوون.

لە سەر مێزە چکۆڵەکەیش، لە پەنای چرا کوژاوەکەی دا، چەند بەستەیەك ڕۆژنامەی دەست لێ نەدراو دانراون، هەندێك هەڵیان دەشێوێنم، بە زمانی فەرەنسین، ئەوی تازەیان هی سێ مانگ لەمەوبەرە: ژوئییەی ساڵی ١٩١٨، ڕۆژنامەیەکی تری نەکراوەی لێیە: ژانوییەی ١٩٢٧، نوامبەری ١٩٢٦، ئەوەی کە لە هەموویان کۆنترە هی ئۆکتۆبەری ١٩١٩ یە، بیر لەوە دەکەمەوە: ئەوە نۆ ساڵە کە لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکی هەڵنەداوەتەوە. ئەوە دەبێتە ساڵێك دوای مێرشەکە، لەو کاتە بەم لاوە

ئاخرین شتێك كە پردی پێوەندی ئەو بوو، لە نێـوان هاوڵاتییـەكانی دا وە لای ناوە.

پیاوەكان تابووتەكان دەهێنن و تەرمەكە دەخەنـە ناوییـەوە، پاشـان مـن دەكەومە بیری ئەو ڕۆژەی، كە بیستوپێنج ساڵ بەر لـە ئێسـتا، ئـەو پێـی نایە نێو ماڵەكەی منەوە و نامەیەكی دایە دەستم كە لە پاناما، بە دەستی فەرماندەی گشتیی كەنارەكانی ئۆقیانووسی ئەتڵەس: سەرهەنگ ئورلیانو بۆئێندیا، نووسرابوو.

لە نێو تاریكییەكەدا، خەریكی پشكنینی یەخدانە قووڵەكەم، هیچ شـتێكی ترم تێدا نەدی، بێجگە لەو كەلوپەلەی بیستوپێنج ساڵ لەمەو بـەر لەگـەڵ خۆی دا هێنابوونی. بە جوانی لە بیرمە، وا دەزانم ئەمڕۆ بوو، دوو كراسـی كۆنەی بێ بایەخ، تاقمێك ددانی دەستكرد، وێنەیەك و سوێندنامەیەكی لە بەرگگیراوی كۆنە، بەر لەوەی سەری تابووتەكە بنێنەوە بە نێو دیوەكـەدا دێم و دەچم، هەر جارەی شتێك هەڵدەگرم و لە لایەكی دادەنـێم، وێنەكـە هێشتا هەر لە بنی یەخدانەكە دایە، هەر ڕاست لەو شوێنەدایە كە ئەو دەم تێـی دا بـوو. وێنەیـەكی كۆنـەی ئەفسـەرێكە، میـداڵێكی لـە خـۆی داوە، وێنەكـە و ددانــە دەســتكردەكان و ســوێندنامەكە هەڵــدەگرم و وێكــڕا دەیانخەمە نێو تابووتەكەوە.

هەر كە لە كارەكـانم دەبمـەوە، ئامـاژە بـە پیاوەكـان دەكـەم و ئـەوانیش سەری تابووتەكە دەنێنەوە، بیر لەوە دەكەمەوە، ئێستا سەفەرێكی تـری لە پێشە.

ئاساییترین کار ئەوە بوو، ئەو کەلوپەلەی ڕۆژی ئەوەڵ لەگەڵ خۆی دا هێنابوونی لەم سەفەرەی ئاخریشیدا لەگەڵ خۆی دا بیان بات و لێرە بە جێیان نەهێڵێت، بە لانی کەمەوە ئەو کارە لە هەموو کارێکی تر سروشتیتر دەنوێنێ، پاشان چاوێکی لێ دەکەم و هەست دەکەم بۆ یەکەمین کەڕەت بەهێمنی مردوە، چاوێك بە نێو وەتاغەکەدا دەگێڕم، دەبینم تایەك لە کەوشەکانی لە سەر قەنەفەکە بە جێ ماوە. دەست دەدەمە کەوشەکە و ئاماژە بە پیاوەکان دەکەم، ئەوانیش سەری تابووتەکە، ڕاست لەو کاتەدا کە شەمەندەفەرەکە هۆڕین لێ دەدا و لە کلکەی ڕێگاکەوە لە چاوان ون دەبێ، هەڵدەدەنەوە. هەست دەکەم: کاتژمێر دووەسێ خولەکە، دوو سێ خولەکی ڕۆژی دوازدەی سێپتامبەری ۱۹۲۱، هەر ڕاست ئەو سەروبەندی ساڵی ۱۹۰۳ ئەو پیاوە بۆ یەکەمین جار لە پشت مێزی نانخواردنەکەی ئێمە دابنیشت و داوای لێ کردین، هەندێك گیای بۆ خواردن بدەینێ، ئادێلایدا لەو کاتەدا لێی پرسی: «هەر گژوگیای ئاسایی، دوکتۆر! ؟

ئەویش زۆر بەڕێز و ئەدەب و بە منگەمنگێکەوە گوتی: «هەر گژوگیای ئاسایی، خاتوون... هەر لەو گژوگیایەی دەیکەنە بەر دەم ئەسپەکان بیخۆن.

ڕاستییەکەی ئەوەیە، مێمیٚ ئێستا لەمماڵەدا نییە و لەوانەیە هیچ کەسێکیش نەزانیٚ لە کەنگێوە لەم ماڵەدا نەماوە. ئاخرین کەڕەتێك کە بە چاوی خۆم دیتم، یازدە ساڵ لەمەو بەر بوو... هێشتا دووکانە چکۆڵەکەی سەر ئانیشکەی ئەو کۆڵانەکەی هەر مابوو، دووکانێك کە وردەوردە بە پێی پێداویستیی دراوسێکان گۆڕانی بە سەردا هات و بوو بە فرۆشگایەکی تایبەت و پڕ بوو لە کەلوپەلی جۆراوجۆر و ڕەنگاوڕەنگ. سەرنجدان و وردبینی و ماندووبوونی تایبەتی مێمیٚ کارێکی وای کردبوو هەموو شتەکان لە سەر جێی خۆیان بە ڕێکوپێکی دابنرێن.

مێمیٚ هەموو ڕۆژێك لە بەری بەیانییەوە هەتا زەردەی ئێواریٚ بە یەکێك لەو چوار مەکینەی دوورمانی دامستیکی کە لەو سەردەمەدا لە شاردا هەبوون جلوبەرگی بۆ دراوسێکان دەدووری، یان لە پشتی مێزەکەوە بە سەروڕوویەکی خۆشەوە، کە تایبەتمەندیی سووڕپێستەکانە، مشتەرییەکانی بە ڕێ دەکرد، هەمیشە هەر وا سەروڕوو خۆش و دەم بە

بزه بوو.. هەمیشه ڕووگەش و شاد و لەسەرەخۆ بوو: تێکەڵاوییەك لە پاکی و بێ متمانەیی.
من لەو کاتەوەی که مێمێ له ماڵی ئێمه ڕۆیشت و بە جێی هێشتین ئەم دیوەتەوە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیه له بیرم نایێ و نازانم لە کەنگێوە هاتوەتە ئێرە، هەتا لەگەڵ دوکتۆردا و له قوژبنی ئەم ماڵە تەریکەدا بە یەکەوە بژین، یان چلۆن توانیی هەتا ئەو ڕادەیە خۆی سووك و بێ بایەخ بکات و ببێتە دڵداری پیاوێکی ئاوا سووك و بێ قابیلەت، کە لەو کاتە هەستیارەدا له دەرمانکردنی ئەو خۆی بواردبوو. سەرەڕای ئەوەیش، ئەو وەك ڕزکچی بابم و دوکتۆریش وەك میوانێکی هەمیشەیی، له ماڵی بابم دا دەژیان و سەرەڕای ئەوانە و زۆر شتی تریش...
زڕدایکم دەیگوت، دوکتۆر مرۆڤێکی باش نەبوو، لەگەڵ بابم دا کەوتبوە دەمەقاڵە و دەیەویست ڕازی بکات نەخۆشییەکەی مێمێ شتێکی ئەوەندە زۆر مەترسیدار نییه، بەڵام ئەو تەنانەت هەر ئامادەیش نەبوو، با هەر لە بەر دڵی بابیشم بێ، له دیوەکەی بێتە دەرێ و به سەرپێوە چاوێکی لێ بکات، بێجگە لەوەیش، تەنانەت ئەگەر هەر وای دابنێین ئەو کچە سوورپێستە، نەخۆشییەکی سووکیشی گرتبێ، لانی کەم بە هۆی ئەو هەموو ڕێز و حورمەتەی له ماڵی ئێمەدا لێی گیرابوو، دەبوو پشکنینی هەر بۆ بکردبایە.
نازانم چی ڕووی دا، هەر ئەوەندە دەزانم بەیانییەك، که هەستام نه مێمێ مابوو نه دوکتۆر، پاشان به فەرمانی زڕدایکم دەرگای وەتاغەکەی دوکتۆر بۆ هەمیشه داخرا و ئیتر هیچ کاتێك ناوی ئەو بە سەر زاری دا نەهاتەوە،

هەتا ماوەی چەند ساڵێکی بە سەردا هات و ئەویش لەو کاتەدا کە خەریکی دوورینی جلوبەرگی بووکێنییەکەم بوو.

مێمێ پاش ئەوەی لە ماڵی ئێمە ڕۆیشت، سێ یان چوار یەکشەممە بۆ نوێژی شێوان هاتە کڵێسا، کراسێکی گوڵداری ئاوریشمینی لە بەر دەکرد و کڵاوێکی جلفانەی، کە هەموو جارێك بە چەپکەگوڵێکی دەستکرد، دەینەخشاند لە سەر دەنا. ئەوەندی لە ماڵی ئێمەدا بوو، ژنێکی زۆر سادە و ساکار بوو، تەنانەت زۆربەی کاتەکان هەر بە پێخاوسی دەهات و دەچوو، بەڵام ئەو ژنەی لەو ڕۆژی شەممەیەدا لە کڵێسا دیتم، لەگەڵ ئەو مێمێیەی جاران دەمناسی، بە قەد ئەرز و ئاسمانیان گۆڕان بە سەردا هاتبوو، ناسینەوەی زۆر دژوار بوو، ئەو لە ڕیزی پێشەوە، لە نێو ژنەکاندا، گوێی لە وتەکانی ئینجیل ڕادەگرت و بەو جلوبەرگە دەقدراوانەیەوە کە لە بەری دەکردن و خۆی پێوە ڕادەنا، ڕواڵەتێکی نوێ و بە پۆزی بە خۆیەوە گرتبوو. ئەم ڕواڵەتە نوێیەی و ئەو ئاکارە هەرزانەی بە هیچ کولۆجێك لێ نەدەوەشاوە و زۆر ناحەز و دزێو دەهاتنە بەر چاو. ئەوەندە بە دڵگەرمییەوە ڕێوڕەسمەکەی بە ڕێوە دەبرد، هیچ کەس هەتا ئەو کاتە شتی وای نەدیبوو، تەنانەت ئەو کاتەی سەلیبی دەکێشا هەر ئەو ڕواڵەتەی بوو، کە لە دەرگای کڵێساوە دەهاتە ژوورەوە، بە شێوەیەکی وا خۆی دەنواند، هەموو لایەکی تووشی سەرسووڕمان کردبوو. ئەو کەسانەی دەیاندەزانی کارەکەری ماڵی ئێمە بوە، تەواو حەپەسابوون و سەریان لەو کارەی سووڕمابوو، ئەو کەسانەی

هەتا ئەو کاتەیش نەیان دەناسی، بە وردی سەرنجیان دەدایێ و لێیان دەڕوانی.
ئەوەی بۆ من زۆر جێگەی پرسیار و سەرسووڕمان بوو، ئەوە بوو کە چ شتێك بۆتە هۆی ئەوەی ئەو ژنە هەتا ئەو ڕادەیە گۆڕانی بە سەردا بێ!
بۆ چی مێمێ لە ماڵی ئێمەدا نەماوە؟ لە ڕۆژی یەکشەممەدا هەر لە داری کریسمەس دەچوو، ئەوەندی جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ لە بەر کردبوو، سێ ژن دەیانتوانی لەبەریان بکەن و بە پۆشتە و پەرداخییەوە لە ڕێوڕەسمی جەژنی پاکدا بەشداری بکەن. ئەو کچە سووڕپێستە ئەوەندی سڵسڵە و پلْپلەی لە خۆی دا بوو، کە دەتوانرا ژنی چوارەمیشیانی پێ بڕازێنێتەوە.
دوای نوێژ خوێندنەکە، هەم ژنەکان و هەم پیاوەکان لە بەر دەرگا چاوەڕوان وێستان هەتا لە کاتی هاتنەدەرەوەی دا بیبینن. لە دوو ڕیزدا لە سەر پلیکانەکانی بەر دەرگاکەی دەرێ ڕاوەستابوون. کەس ورتەی لێوە نەدەهات، شێوەی چاوەڕوانیکردنەکەیان تانە و توانجی لێ دەباری، پێم وایە شێوەی ڕاوەستانەکەیان هاواری دەکرد، نهێنییەکیان لە دەروون دایە و بە مەبەستێکی تایبەتەوە ڕاوەستاون، هەتا ئەو کاتەی مێمێ هاتە دەرێ و چاوەکانی نووقاند و هاوکات چەترە حەوت ڕەنگەکەی هەڵدا و بەو شێوەیە و بەو پێڵاوە پاژنە بەرزانەیەوە وەك ژنێکی جڵف و لەخۆبایی و سەرسەری بە نێو ڕیزی پیاو و ژنەکاندا تێپەڕی، هەتا یەکێك لە پیاوەکان سەری ڕیزەکەی وێك هێناوە و مێمێ لە نێوانیاندا گیری خوارد.

لـەو کـە کەوتــە ئـەو هەلومەرجــەوە زۆری پــێ ســەیر بــوو، بــە ســەر سوورمانەوە چاوی بە هەموویان دا دەگێـڕا و هـەولّی دا وەك ڕواڵەتەکـەی کـە زیـاتر لـە حەنەکچییەك دەچوو بزەیـەکی دەسکردیش بێنێتـە سـەر لێوی.

بەڵام کاتێك کە بە مابەینی هەر دوو ڕیزەکەدا تێپەڕی، چـەترەکەی ئاواڵـە کردەوە و ملی ڕێگەکەی گرت. بابم کە لە لای منەوە ڕاوەستابوو، دەستی گرتم و کێشامییە نێو ڕیزەکەوە، هەر کە پیاوەکان ویستیان سەر لە نـوێ سەر ڕێگەکەی لێ بگرن، بابم سەر ڕێگاکەی بۆ مێمێ ئاواڵە کرد و ئەویش بە پەلە گومبەتەی خۆی دا هەتا لەو کەلەبەرەوە بۆی دەرباز بێ. بابم بـە بێ ئەوەی چاوێك لەو خەڵکە بکات، بە هەیبەتێکەوە دەستی مێمێی گـرت و وەك ئەوەی هەر هیچیان بە پووشێکیش دانەنێ، بـە فیزێکـەوە بـە نێـو خەڵکەکەی دا تێپەڕاند. هەر ئەو هەیبەتەی کە کاتێـك دەیەویسـت کارێـك بە دژی ویستی خەڵکی بکات بە خۆیەوە دەگرێ.

£

£

ماوەیـەکی پێچـوو هـەتا ئـەوەی زانـیم مێمـێ لـە مـاڵی ئێمـە ڕۆیشتوە، بۆتە دڵداری دوکتۆر و لەگەڵ ئەودا لە نێوماڵێکدا بـە یەکـەوە دەژین. ئەو ڕۆژانە هەمیشە دەرگای دووکانەکەی ئاواڵـە بـوو، مێمـێ هـەر وەك سەرەژنێکی خانومان و و جێی ڕێز، زۆر بە ڕێکوپێکی و بەردەوام لە ڕێـوڕەسمی نوێـژی کلێسـادا بەشـداریی دەکـرد و گـوێی نەدەدایـە هـیچ

قسەوباسێك و دەتگوت نە بای دیوە نە بۆران، هەر وەك ئەوەی لە یەكشەممەكەی پێشوودا مێشێكیش نەی گەستبێ و هیچ ڕووی نەدابێ، بەلام پاش ئەوەی دوو مانگ بە سەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی، ئیتر وردەوردە لێی سارد بوەوە و بۆ هیچ ڕێوڕەسمێك لاقی نەنایە نێو كڵێساوە و كەسیش لەو دووكانە نەی بینییەوە.

ئەو سەردەمەی كە دوكتۆر لە ماڵی ئێمە بوو هەر وا دەزانم ئەوڕۆیە و بە جوانی لە بیرمە، ئێستایش سمێڵە ڕەش و قەیتانییەكەیم هەر لە بەر چاوە، ئەو چاوە زەقانەیم لە خەیاڵە، كە وەك گوربەپشیلەیەكی برسی و تامەزرۆ دەیبڕینە باڵای ژنان و زیتی دەكردنەوە و لە ژنانی دەڕوانی. لە بیرمە هیچ كاتێك توخنی نەدەكەوتم و لێی نزیك نەدەبوومەوە، هەر لەبەر ئەو تایبەتمەندییانەی، وەك ئاژەڵێكی ئەفسانەیی لێم دەڕوانی و ئەو كاتەی هەموو خێزانەكە لە پشت مێزی خواردنەكە هەڵدەستان، ئەو هێشتا هەر دادەنیشت و خەریكی خواردنی ئەو گژوگیایە بوو، كە ئەسپەكان دەیانخوارد.

سێ ساڵ لەمەو بەر كە بابم ناساغ بوو، لە جێگادا كەوتبوو، دوكتۆر هەر لە ژوورەكەی خۆیشی نەهاتە دەرێ. هەر ڕاست وەك ئەو شەوەی، بۆ دەرمانكردنی بریندارەكان لە جێگەی خۆی نەبزووت. تەنانەت جارێكیش ڕازی نەبوو خۆی بشەمزێنی و سەردانێكی لای بابم بكات. هەر وەك شەش ساڵ بەر لە ئێستایش، خۆی لە پشكنین و دەرمانكردنی ژنێك بوارد، كە بڕیار بوو دوو ڕۆژ دواتر عاشقی یەكتر بن و لە نێو ماڵێكدا بە یەكەوە بژین.

بەر لەوەی خەڵکی شار بێنە سەروکاری دوکتۆر، ئەو لە ژوورەوە دەرگای ئەو ماڵە چکۆڵەی لە سەر خۆی گاڵە دابوو، پاش ئەوەی دەرگای دووکانەکەیش گاڵە درا. مێمیّ بەردەوام و ساڵەهای ساڵ لە نێو ئەو ماڵەدا ژیا، لە پاش ماوەیەکی زۆر خەڵکەکە بۆیان دەرکەوت، مێمیّ دیار نییە و شوێنبزر بوە.

ئەم هەواڵە لە کاغەزێکی واژۆ نەکراودا نووسرابوو و بە ڕووکاری دەرگای دەرەوەی ماڵەکەیانەوە هەڵیواسیبوو. لەو کاغەزەدا نووسرابوو، دوکتۆردڵدارەکەی خۆی کوشتوە و لە نێو باخچەی حەوشەکەیدا لە چاڵی ناوە، ئەویش لە ترسی ئەوە بوە، نەکا خەڵکی شار فریوی بدەن و بە دەستی ئەو ژنە دەرمانخواردووی بکەن، بەلاّم من مێمێم بەر لە زەماوەندەکەی خۆم دیبوو، ئەم باسە دەگەڕێتەوە بۆ یازدە ساڵ لەمەو بەر، ئەویش ڕاست ئەو ڕۆژە بوو کە لە ڕێورەسمی ئایینی لە کلێسا دەگەڕامەوە، ژنێکی سوورپێستم بینی هاتە بەر دەرگای دووکانەکەی و بە ڕوویەکی خۆش و دەم بە خەندە پێی گوتم: «دەستت خۆش بیّ چابێلا ... خەریکی بە دزیی ئێمەوە زەماوەند دەکەیت و لێیشمان ناگێڕیتەوە؟!

£

£

پێی دەڵێم: «بەڵیّ، بە دڵنیاییەوە وەك تۆ دەفەرمووی هەر وا بوە...

پاشان ئاڵقەی تەنافەکە، کە لە لای سەرێکییەوە شی بۆتەوە و ڕیشاڵی تازە هەڵبڕاوی پێدا شۆڕ بوەتەوە، دەکێشمە خوارێ و ئەو گرێیەی پێشتر پیاوەکانم بۆ داگرتنی لاشەکە کردبوویانەوە، سەر لە نوێ وەك خۆی دەیبەستمەوە و سەرێکی تەنافەکە لە سەر کاریتەکەوە فڕێ دەدەمە ئەو دیو و ئاڵقەی تەنافەکە هەر وا بە هەڵواسراوی بە سەر کاریتەکەدا شۆڕ دەبێتەوە.

سەرۆك شارەوانی خەریکە بە کلاوەکەی خۆی باوەشێن دەکات، لە بەر تەنگەنەفەسی ڕەنگی تەواو هەڵ بزرکاوە، چاو لە ئاڵقەی تەنافەکە دەکات و تاقی دەکاتەوە، بەوردی هەڵی دەسەنگێنێ و دەڵێ: «باوەڕ ناکەم ئەو تەنافە ناسکە تاقەتی ڕاگرتنی ئەو لاشە قورسەی هێنابێ.»

منیش لە وەڵامی دا دەڵێم: «هەر ئەو تەنافە ناسکە ساڵەهای ساڵە ئەو هەڵۆرکەی پێدا هەڵواسراوە و تاقەتیشی هێناوە.

ئەو دەست دەبات و کورسییەك دێنێتە پێشەوە و کلاوەکەیم دەداتە دەست و بە هەر دوو دەست خۆی بە تەنافەکەدا هەڵدەواسێ، لاقەکانی لە ئەرز دەبڕڕێن سەروچاوی دەبێتە پتی خوێن و سوور هەڵدەگەڕێ، پاشان لە سەر کورسییەکە ڕادەوەستێ و چاو لە سەری تەنافەکە دەکات، کە پێشتر خۆی پێدا هەڵواسیبوو دەڵێ: «قەت ئەمە جێی باوەڕ نییە... ئەم ئاڵقە خۆ بە ملی مندا ڕاناگاتەوە.

هەر لەو کاتەدا هەست دەکەم بە دەستی ئانقەست خەریکە بەهانە دەهێنێتەوە، بۆیە ئەو قسانە دەکات هەتا ڕێگایەك ببینێتەوە بۆ دەربازبوون و بەو بیانوەوە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنەکەی دوا بخات،

ڕاست چاو لە چاوەکانی دەبڕم و لە ناخەوە هەڵی دەسەنگێنم و پێی دەڵێم: «یانی هەتا ئێستا نەت زانیوە ئەو زۆر لە تۆ کەڵەگەتر بوو؟
ئەویش ئاوڕێک دەداتەوە و چاوێك لە تابووتەکە دەکات و دەڵێ:
«فەرقێکی وایشی نییە» من باوەڕ ناکەم بەم تەنافە توانیبێتی ئەو کارە بکات.
من دڵنیام هەر بەو شێوە بوە، ئەویش دڵنیایە، بەڵام بە ئەنقەست دەیەویست کارەکە دوا بخات، لەوەی دەترسێ گێچەڵێك بۆ خۆی ساز بێ. ئەو ترسەی دوو لایەنە و دژ بە یەکن، هەم دەیەوێ ڕێوڕەسمەکە دوا بخات و هەم چاوەدێری بە سەر کارەکانییشەوە هەبێ، پاشان دەچێت بۆ لای تابووتەکە و لە سەر پاژنەکانی ڕادەوەستێ، چاو لە من دەکات و دەڵێ: «دەبێ بە چاوی خۆم بە دارەکەوە ببینم، هەتا بە تەواوی لێی دڵنیا بم.
ئەگەر ئەو کارە بە دەست من بوایە، درێغیم نەدەکرد. بە پیاوەکانم دەگوت، سەری تابووتەکە هەڵ بدەنەوە و وەك چەند ساتێك لەمەو بەر بە تەنافەکەدا هەڵی بواسنەوە، بەڵام ئەو کارە بۆ کچەکەم و لەبەر چاوی ئەودا زۆر سەخت و دژوار بوو، بۆ منداڵەکەیش کارێکی ئەستەم بوو، هەر چەندە ئەو کارە لەگەڵ ئەو لاشەیەدا ئازاردانی لەشێکی بێ دەسەڵات و ناڕەحەتکردنی مرۆڤێك بوو، کە تازە لە پاش تەمەنێکی دووروودرێژ بۆ یەکەمین جار تامی حەسانەوەی دەچەشت. ئەو کارە زۆری ئازاردەدام.
سەرەڕای ئەوەیش ڕاگوێزتنی لاشەیەك کە بە ئارامی و گەورەیییەکی زۆرەوە لە سەر جێگای خۆی ڕاکشاوە، لەگەڵ یاسای مرۆڤایەتی و

مرۆڤدۆستیدا نەدەگونجا و دژایەتیی هەبوو، بەڵام دەبوو ئیزنم بدایە هەتا هەڵی بگرن و دیسان بە دارەکەوەی بکەن. هەتا بزانم ئەو کابرایە چەندە لاسارە و لە سەر قسەی خۆی سوور و پێداگرە! بەڵام ئەوە کارێکی زۆر دژوار و ناحەزە. هەر بۆیە پێی دەڵێم! «چاکتر وایە سەرینی ئەرخەیانی بنێمە بن سەرت و دڵنیات بکەم کە من، هەرگیز پێیان ناڵێم ئەو کارە بکەن، ئەگەر تۆیش ئەو کارەت پێ خۆشە، ئەوە بە بەرپرسایێتیی خۆت هەڵی بواسەوە و بەرپرسیارێتییەکەیشی لە ئەستۆی خۆتە! دەبێ لەوەیش ئاگادارت بکەمەوە، من نازانم لە کەنگێوە مردوە.

هێشتا هەر لە لای تابووتەکەوە لە جێی خۆی جووڵەی نەکردوە، چاوێك لە من و پاشان لە ئیزابێل و دواییش لە منداڵەکە، سەر لە نوێ لە تابووتەکە دەکات. لەناکاو نێو چاوانی تێك دەنێ و بەتووڕەییەوە دەست دەکات بە هەڕەشە و دەڵێ: «تۆ دەبێ باش بزانی، کە ئەم کارەتچ گرفتێك ساز دەکات!

منیش کە چاك لە مەبەستی هەڕەشەکەی دەگەم، لە وەڵامی دا دەڵێم: «دیارە دەزانم،.. من هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەم.» ئەویش کە دەستەکانی خۆی ڕێك دەگوشێ و ئارەق لە نێوچاوانی دەتکێ و بە شێوەیەکی مەبەستدار و پێکەنین دەجووڵێنەوە و ڕووم تێ دەکا و دەڵێ: «وەڵامی من بدەرەوە... شەوی ڕابردوو، چۆنت زانی ئەم کابرایە خۆی خنکاندوە؟

سەبر دەکەم هەتا لێم دێتە پێشەوە و لە بەرانبەرم دا ڕادەوەستێ، جووڵە ناکەم، ڕاست هەناسە گەرم و ئاورینەکانی بە سەروچاوم دا

دەپرژێن... هەندێك سەبر دەگرێ... کڵاوەکەی دەداتە بن هەنگڵی و پاشان پێی دەڵێم: «کاتێك ئەو پرسیارەم وەك کەسێکی بەرپرس لێ دەکەیت، ئەو کاتە بە خۆشحاڵییەوە وەڵامی پرسیارەکەت دەدەمەوە.

لە کاتی قسەکردنم دا نەشلوێ دەبێ و نە هەست بە نیگەرانی دەکات. ڕووم تێ دەکات و دەڵێ: «دڵنیا بە سەرهەنگ... ئەو پرسیارەت بە شێوەیەکی فەرمی لێ دەپرسم.

خۆمی بە دەمەوە دەدەم هەتا بە هەر شێوەیەك پێی خۆشە ئاوا بجووڵێتەوە. دڵنیام هەر چەندە هەوڵ بدات بە فەرمی بدوێت و باسەکە ئاڵۆز بکات، لە کۆتاییدا ناچار دەبێ سەر بۆ ڕاستی و ئەقڵانییەت شۆڕ بکاتەوە. ئەویش بە سەبر و لەسەرەخۆیی. ئەوەی لە سەر سەبرانە لە سەر خێرانە. ڕووی تێ دەکەم و پێی دەڵێم: «لە بەر ئەوە تەنافەکەیان پچڕاند و لاشەکەیان داگرت، چونکە نەم دەتوانی سەبر بگرم و تاقەتم نەدەهێنا هەر ئاوا بە هەڵواسراوی بمێنێتەوە، هەتا جەنابتان بڕیار بدەن و هەستن و بێن بۆ ئێرە ! دوو کاتژمێر لەمەو بەر داوام لێ کردی تەشریف بهێنی، ئەو هەموەی خایاند هەتا جەنابتان ئەو دوو کۆڵانە ببڕن و بگەنە ئێرە !

هێشتا ئەو هەر ڕەق و وشك لە سەر جێگاکەی خۆی ڕاوەستاوە، خۆم دەدەم بە سەر گۆچانەکەم دا، لە بەرانبەری دا ڕادەوەستم. هەندێك بە پێشەوەدا دەنووشتێمەوە و دەڵێم: «بێجگە لە ئەوانەیش، ئەو پیاوە هاوڕێی من بوو.

بەر لەوەی قسەکانم کۆتایی بیٚ، بە توانجێکەوە شیلەبزەیەك دەیگریٚ. هەناسە گەرم و بۆگەنەکەی بە سەروچاوم دا دەدریٚ و دەلیٚ «هەرگیز لەوە ئاسوودەتر نابیٚ، بە بڕوای تۆیش وا نییە؟»

لە ناکاو بزەی لە سەر لێوەکانی کاڵ دەبنەوە و بە تووڕەییەکەوە دەڵیٚ: «وا دیارە پێشتر زانیوتە ئەم پیاوە نیازی ئەوەی هەبوە خۆی بکوژێت؟

بە دڵنیاییەوە دەمزانی نییەتی لەو کارەی ئەوەیە باسەکە ئاڵۆز و شپرزە بکات، بۆیە بە ئارامی و لەخۆبردووییەوە گوتم: «دووبارەی دەکەمەوە، هەر کە زانیم خۆی لە دار داوە، یەکەمین کارم ئەوە بوو هەستام و هاتم بۆ شوێنی کارەکەی تۆ، ئێستا دوو کاتژمێر بە سەر ئەو کاتەی، کە هاتم بۆ ئەویٚ تیٚ پەڕیوە .

هەر وەك ئەوەی پرسیارێکم لیٚ کردبیٚ، دەلیٚ: «خەریك بووم نانی نیوەڕۆم دەخوارد.

منیش لە وەلامی دا دەلێم: «دەزانم. تەنانەت پێم وایە دوای نانخواردنەکەت سەر خەوێکیشت شکاندوە.

ئیترهیچ وەلامێکی بۆ گوتن پیٚ نییە و پاشەوپاش دەکشێتەوە، چاو لە ئیزابێل دەکات کە لە لای منداڵەکەیەوە دانیشتوە. چاوێك لە پیاوەکان دەکات، لە کۆتاییشدا لە من دەڕوانیٚ. ڕووخساری گۆڕانی بە سەردا هاتوە... بە ڕواڵەت بە شوێن شتێکدا دەگەڕیٚ، هەتا بۆ ماوەیەکیش بیٚ خۆی پێوە بخافڵێنیٚ، ڕووی لە من وەردەگێڕیٚ، دەچێت بۆ لای پۆلیسەکە و شتێکی بە گوێدا دەچرپێنیٚ: پۆلیسەکە سەری بۆ دەلەقێنیٚ

و لە وەتاغەکە دەچێتە دەرێ. پاشان دەگەڕێتەوە و قۆڵی من دەگرێ و دەڵێ: «سەرهەنگ، وەرە بۆ ئەو دیوەی تر، هەندێکم کار پێتە.
ئێستا شێوەی قسەکردنەکەی بە تەواوی گۆڕاوە، تووڕە و پەرێشانە و هەر بە دەم چوونە نێو ژوورەکەی ترەوە. هەست دەکەم بە بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ، بە دەستی باسکم ڕێك دەگوشێ. لە دڵی خۆم دا دەڵێم دەزانم دەیەوێ چم پێ بڵێت.
ئەم وەتاغە بە پێچەوانەی وەتاغەکەی تر گەورە و فێنکە. ڕووناکی لە حەوشەکەوە دێتە ژوورەوە... لێرە چاوە ترساوەکانی و بزە دەستکردەکەی کە لەگەڵ چاوەکانی دا یەکتری ناگرنەوە، دەبینم. گوێم لە دەنگییەتی: «سەرهەنگ لەوانەیە بتوانین سەری باسەکە بە شێوەیەکی تر وێك بێننەوە و کۆتایی پێ بهێنین و ئاوێك بکەین بەم ئاورەدا.
منیش بە بێ ئەوەی دەرفەتی قسەکردنی پێ بدەم، لێی دەپرسم: «بە چەندە؟
ئیتر لەو کاتە بەو لاوە ئەو دەگۆڕێ و دەبێتە کەسێکی تر.

£

£

مێمێ قاپێك ژێلە و دوو بابۆڵەی لەگەڵ خۆی هێنا، هەر بەو شێوەیە سازی کردبوو، کە لە دایکمەوە فێر ببوو. کاتژمێر نۆی پیشان دەدا.

مێمیٚ بەرانبەر بە من لە قوژبنی دووکانەکەدا دانیشتبوو، بە بیٚ ئیشتایی دەیخوارد، هەر دەتگوت ژێلە و بابۆڵەکان، بەهانەیەك بوون بۆ ئەو چاوپێکەوتنەی ئێمە، چاك هەستم بەو ڕازە کردبوو، دەتگوت لە نێو دڵی دام، لێی گەڕام هەتا بە تەواوی لە دونیای خەیاڵی دا بکەوێتە مەلەکردن، ئەو بە تامەزرۆییەکی یەکجار زۆرەوە گەڕابوەوە بۆ ڕابردوو، ڕووخساری لە بەر تیشکی ئەو چرا نەوتییەی لە سەر تاقەکە دانرابوو، سیس و ژاکاوتر بوو لەو کاتەی بە کڵاو و پێڵاوی پانییە بەرزەوە دەهات بۆ کڵێسا. ئەو شەوە دیار بوو هەستێك دڵی مێمیٚ ختۆکە دەدا هەتا بیرەوەرییەکانی ڕابردووی بژێنێتەوە. باسی لە گەورەیی و بە شکۆیی بنەماڵەی دایکم دەکرد. لە ساڵەکانی سەدەی ڕابردوو، بەر لە شەڕی گەورە، وەك سالارە ژنێك بە فەرمی و لەسەرەخۆ بیری لە دایکم دەکردەوە. ئەو شەوە من لە کڵێسا گەڕامەوە و ئەو بەو شێوەیە سەرکۆنەی کردم و دایکمی بیر دەهێنایەوە. لەو سەردەمەدا من زۆرم پێویست بە دایکم بوو، هەوڵم دەدا بە جوانی بهێنمەوە بە چاوم. مێمیٚ دەیگوت: «هەر دەڵێی لەگەڵ دایکت دا سێویکن لە ناوەڕاستدا قاش کراون.

منیش بە ڕاستی و بە دڵەوە باوەڕم پیٚ دەکرد، لە بەرانبەر ئەو ژنە سوورپێستەدا دانیشتبووم و ئەویش بە ڕاوێژێکی پڕ لە تاموچێژ و شیرینییەکی تایبەتەوە، قسەی بۆ دەکردم.

دەتگوت ئەو بیرەوەرییانەی ئەو دەیانگێڕێتەوە لە ناخی ئەفسانە کۆنەکانەوە هەڵدەقوڵێن، باوەڕ پیٚ کردنیان دژوار بوو، بەڵام لە هەمان

کاتدا ئەو بیرەوەرییانەی بە دڵێکی پاك و بە دڵنیاییەوە دەهێناوە یاد، وەك ئەوەی بڵێی تێپەڕینی ڕەوتی زەمان ئەو ئەفسانانەی وە ڕاست گێڕاوە، ئەو ڕاستییانەی زۆر لە ئێستای ئێمەوە دوورن و دەکرێ بیاندەیت بە دەست بای فەرامۆشییەوە.

باسی ئەو سەفەرەی دەکرد، کە بابم و دایکم لە ماوەی شەڕدا کردبوویان و لەو چاوپێکەوتنە دژوارە دەدوا، کە بوو بە هۆی مانەوەیان لە ماکاندۆ. ئەوان لە ترسی شەڕ و کوشتار هەڵاتبوون و بە دەم ڕێگایشەوە بە شوێن جێگەیەکی بە پیت و ئارامدا گەڕابوون هەتا لێی نیشتەجێ بن. هەتا ئەوەی چیرۆکی گوێلکێکی زێڕین دەبیستن و بە بۆنەی ئەوەوە گەییشتنە ئەم شوێنە، کە بەرەبەرە خەریك بوو شارێك بیچمی لێ دەگرت. ئەم شارەی کە بە دەست چەند بنەماڵەیەکی تەرە و پەرپوە بناغەکەی داڕێژرابوو، ئەنداماکانی ئەو بنەماڵانە، ڕاگرتن و پاراستنی ڕێوڕەسمە ئایینییەکانەکانیان بە ئەندازەی دابەستنی بەرازەکانیان بە لایانەوە گرینگ و جێی بایەخ بوو.

ماکاندۆ، وڵاتی ئاواتەکان و شوێنی حەسانەوە و حەوانەوە و تاپۆی مانەوەی دایك و بابم بوو. لەم شوێنەدا جێگەیەکی باشیان بۆ بیناکردنی خانوویەك دەستنیشان کرد و لە ماوەی دوو سێ ساڵدا توانییان خانەباغێك و بەهاریەندێك و دوو وەتاغی لێ ساز بکەن. مێمێ هەموو شتێکی مووبەموو بە بێ ئەوەی هەست بە پەشیمانی بکات، دەهێنایەوە بیر و لە بابەت پڕتێچووترین کارەکانەوە بە هەستێکی پڕ لە خۆشییەوە بۆ ژیانی سەر لە نوێی ئەوان، یان ئەو ئازارەی کە بە گۆشت و ئێسکەوە

هەستی پێ کردوە و نەی دەویست هەرگیز چاوی بە چاوی ئەوان بکەوێت دەدوا.

دەیگێڕایەوە کە لە درێژاییی سەفەرەکەیان دا هیچ هەستیان بە ئازار و دژواریی ڕێگا نەکردوە، تەنانەت ئەسپەکانیشیان لەبەر ئەوەی لە دەست گیزەگیز و پێوەدانی مێشوولەکان ئاسوودە بن. لە ژێر کەتانێکی تۆڕی ناسکدا دەخەوتن.

نەك لەبەر ئەوەی بابم مرۆڤێکی دەستبلاو و گەوج بوە، بەڵکوو لەبەر ئەوەی دایکم مرۆڤێکی دڵئاوا و مرۆڤدۆست بوە، ئەو لە سەر ئەو باوەڕە بوە کە خودا هەموو گیانلەبەرەکان بە چاوێك دەبینێ و ئەگەر ئەسپێك لە پێوەدانی مێشەکان بپارێزێت، بە ئەندازەی ئەوەی پێ خۆش دەبێ، کە مرۆڤێك لە بەرانبەر پێوەدانی مێشەکاندا پارێزگاریی لێ بکرێت، کەلوپەلە زۆر و زەوەندەکەیان لە هەموو شوێنێکدا پرشوبلاو ببوونەوە، چەمەدانەکان پڕ بوون لە کەلوپەلی پێشینیان و ئەو کەسانەی بەر لەوەی دایکم و بابم لە دایك بن، مرد بوون، ئەو پێشینییانەی لە مابەینی سی هەتا چل مەتری سەر زەوییشەوە نەدەکرا چاوت بە تەرمەکانیان بکەوێت، سندووقەکان پڕ بوون لەو قاپ و کەوچکانەی کە مێژوویان بە سەر چووبوو. ماوەیەکی زۆر بوو کەڵکیان لێ وەرگرتبوون و مێژوەکەیان دەگەڕاوە بۆ حەوت پشت لەمەو بەری دایکم و بابم. (دایکم و بابم ئامۆزای یەکتری بوون) تەنانەت سندووقێکیان پڕ بوو لە کەلوپەلی پیرۆز و لە هەر شوێنێکیشدا دەمانەوە، بۆ سازکردنی شوێنی نزا و پاڕانەوە کەڵکیان لێ وەردەگرت. چەند سەر ئەسپ و چەند مریشکێك و چوار سووڕپێستی

گواجیرایی (هاوڕێکانی مێمێ) ئەوانە هەر لە بنەماڵەی ئێمەدا گەورە ببوون و تەواوی ئەو ناوچانەیان بە شوێن بابم و دایکم گەڕابوون، زیاتر هەر لە ئاژەڵی ماڵی و دەستەمۆ دەچوون. ئەمانە هەموویان بە یەکەوە کۆمەڵەیەکی سەیر و سەرسووڕهێنەریان پێك هێنابوو.

مێمێ بە دڵێکی پڕ لە غەم و ئازارەوە باسی ئەوانەی دەکرد، مرۆڤ لە نێو قسەکانی دا بەو ئاکامە دەگەییشت، مێمێ تێپەڕبوونی زەمان بە زیانێکی گەورە بۆ مرۆڤ دەزانێ، دەتگوت لە ناخی دڵییەوە، بە هەڵگرتنی باری ئەو ڕازە قورسانەوە ئازاری دیتوە. زۆری پێخۆش بوو، زەمان لە جێی خۆی ڕابوەستایە و، ئەو هێشتا هەر بە دەم ڕێگای ئەو سەفەرەوە بوایە، ئەو سەفەرەی دایکم و بابمی زۆر ئازار دابوو، بەڵام بۆ ئەو منداڵانە، دیمەنی جوان و دڵڕفێنانە، خەوتنی ئەو ئەسپانە لە بن کەتانە ناسك و تۆڕییەکاندا، وەك یارییەکی خۆش و خەونێکی شیرین وا بوە.

دەیگوت وردەوردە هەموو شتێك بەرەو خراپی دەچوو. هاتنیان بۆ گوندی تازەی ماکاندۆ لە ڕۆژەکانی کۆتاییی ئەو سەدەدا بوو، هاتنی بنەماڵەیەکی لە ڕێسمە چوو وێران بوو، هێشتا هەر خەونیان بە ڕابردووی خۆیانەوە دەدیت و پێوەندییان لە گەڵ پێشینە بەشکۆ و پڕ لە شانازییەکەیان دا بە تەواوی نەپسابوو، کە دەستی شەڕ لە یەکی بڵاو کردبوونەوە. ئەو ژنە سووڕپێستە هاتنی دایکمم بۆ ئەم شارە دەهێنێتەوە یاد. دایکم لابەلا لە سەر هێسترێك دانیشتبوو. ڕووخساری زەردهەڵگەڕا بوو، لاقەکانی ئەوەندە هەویان کردبوو بڕستیان لێ بڕابوو، نەیان دەتوانی بە ڕێدا بڕۆن، بێ هیوایی و ناکامی خەریك بوەوە

ورده‌ورده له ده‌روونـی بابیشـم دا گـه‌رای خـۆی دابـنێ، بـه‌لأم ئـه‌و خـۆی ئاماده ده‌کرد به دژی ڕه‌وتی ـبا ـ دا بڕوات و هه‌ر له‌و کاته‌یشدا چاوه‌ڕوان بوو دایکم، ئه‌و منداڵه‌ی لـه مـاوه‌ی ئـه‌و سـه‌فه‌ره‌دا لـه نێـو منداڵـدانی دا هه‌ڵی گرتبوو خه‌ریك بوو ده‌گوورا و له‌گه‌ڵ خۆی هێنا بووی، بهێنێته سه‌ر دونیا. ئه‌و منداڵه‌ی زیاتر چـاوه‌ڕوانی مردنه‌کـه‌ی ده‌کـرا هـه‌تا ئـه‌وه‌ی لـه دایك بێ و چاو به ڕووی دونیادا هه‌ڵبهێنێت.

لـه لاته‌نیشـته‌وه و لـه بـه‌ر شـه‌وقی چـراکه چـاوم لـه ڕووخسـاری مێمـێ ده‌کرد. ئه‌و به‌و هه‌یبه‌ته‌ی به خۆیـه‌وه گرتبـوو، زۆر وه‌ك سوورپێسـتێکی به ته‌واو مانا ده‌چوو. زوڵفه لووس و پڕه‌که‌ی، وه‌ك باڵ و کلکـی ئه‌سـپێك ده‌هاته بـه‌ر چـاوم، وه‌ك بـوتێکی پـیرۆز بـه هه‌یبه‌تـه‌وه دانیشـتبوو. لـه‌و وه‌تاغه گه‌رم و چکۆڵه‌ی پشت دووکانه‌که‌دا بـووین، هـه‌ر لـه تارماییيـه‌کی زه‌رد ده‌چوو، بـه شـێوه‌یه‌ك ده‌دوا کـه ده‌تگـوت شـازاده‌یه‌که و بـاس لـه خه‌زێنه‌یه‌کی بـه نرخـی مێـژوویی ده‌کـات. مـن هـیچ کاتێـك له‌گـه‌ڵ ئـه‌ودا ئه‌وه‌نده‌م هه‌ست به نیزیکایه‌تی نه‌کردبوو، به‌لأم ئه‌و شه‌وه لـه دوای ئـه‌و خورپه ده‌روونییه، هه‌ستم به نزیکایه‌تییه‌کی له ڕاده‌بـه‌ده‌ر کـرد، هه‌سـتم کرد ئه‌و ئه‌وینه‌ی ئێمه‌ی به یه‌کتره‌وه گرێ داوه، زۆر به‌هێزتره له هه‌ست و ئه‌وینی خزمایه‌تی.

له‌ناکاو له نێوان ساتێك بێده‌نگیی مێمێدا، گوێم له ده‌نگی کۆخه‌یه‌ك بوو، ئه‌و ده‌نگه له وه‌تاغه‌که‌ی په‌نامانه‌وه ده‌هات، هه‌ر له‌م ژووری نووسـتنه‌ی ئێستا من له‌گه‌ڵ منداڵه‌که‌م و بابم تێـی دایـن، کۆخه‌یـه‌کی کـورت و وشـك بوو، له پاشان ده‌نگی پاککردنه‌وه‌ی گه‌روو هاته گوێم، له ده‌نگی پیاوێـك

دەچوو کە دەیەویست بە سەر قەنەفەکەی دا بتلێتەوە. مێمێ بۆ چەند ساتێك بێدەنگ بوو، تەمێك لە بێدەنگی ڕووخساری داپۆشی، ئەم پیاوەم بە تەواوی لە بیر چووبوەوە، لەو ماوەدا کە لەوێ بووم، هەستم دەکرد ئەو ماڵە هەر من و ئەو ژنە گواجیراییەی تێدایە، پاشان کەشوهەوای ماڵەکە گۆڕرا. هەستم دەکرد ئەو دەستەی کە ئەو ژێل و بابۆلانەم پێ هەلگرتبوو، بێ ئەوەی تام و چێژم کردبێتن ماندوو بوە. سەرم لێ بردە پێشێ و پێم گوت: «بەخەبەرە ؟ئەو بە ساردییەکەوە لێی دەڕوانیم و بە لالووتێکەوە گوتی: «هەتا ڕۆژ دەبێتەوە خەو ناچێتە چاوی.

لە ناکاو هەستم کرد تەمێك لە غەم و بێ هیوایی ڕووخساری داپۆشی، هەر کاتێك ماڵی ئێمەی بیر دەهاتەوە، مێمێ ئەو حاڵەتەی بە سەردا دەهات.

ژیانی ئێمە گۆڕانێکی بەر چاوی بە سەردا هاتبوو. گوزەرانێکی خۆشمان هەبوو. ماکاندۆ شارێکی قەرەباڵغ بوو، تەنانەت ئەوەندی پوولێ تێدا دەست دەکەوت، کە شەوانی شەممە تەخشان و پەخشانی بکەیت، بەلام ژیانی مێمێ بە سەردەمێکی زێڕین و باشترەوە گرێ درابوو، لە کاتێکدا خەڵکی شار لە دەرەوە خەریکی بڕینەوەی خوریی گوێلکە زێڕینەکە بوون، ژیانی مێمێ لە ژوورەوە، یانی لە کونجی دووکانەکەدا، بە هێچ و خۆڕایی بە فیڕۆ دەچوو. لە بەیانییەوە هەتا شەو خەریکی کاروباری دووکان بوو، شەویش تا بەیانی لەگەڵ پیاوێکدا دەژیا، کە هەتا سپێدەی بەیان خەو نەدەچوە چاوییەوە، ئەویش ئەو پیاوەی کە هەموو کاتی خۆی لە نێو ماڵەکەدا، بە پیاسەکردن تێ دەپەڕاند و بە چاوە

حیزەکانییەوە، کە هیچ کاتێك نەم توانی لە بیری خۆمیان بەرمەوە، بە تامەزرۆییەوە چاوی لێ دەکرد. کاتێك بیر لە مێمێ دەکەمەوە کە ناچارە و دەبێ لەگەڵ پیاوێکدا بژیت، شەوێك خۆی لە دەرمانکردنی ئەو دزیوەتەوە، سەرتاپام غەم دای دەگرێ، ئەو هێشتایش هەر ئەو ئاژەڵە دڕندە و بێبەزەییە بوو کە مانای غەم و ترسی نەدەزانی. ئەو لە بەیانییەوە هەتا شەو، بەردەوام سەری بە هەموو کەلێن و قوژبنەکانی ئەو ماڵەدا دەکرد، بە شێوەیەك کە مرۆڤە ئاقڵ و سەبوورەکانیش لە دەست ئەو شێت و عاسی دەبوون.

هەر کە هاتمەوە سەر خۆم. هەستم کرد ئەو لە نێو وەتاغەکەی دا هەر بە خەبەر و کاتێك گوێی لە دەنگی ئێمە بێ کە لە نێو دووکانەکەدا قسە دەکەین، چاوە زەقەکانی هەڵدەهێنێ، هەر بۆیە هەوڵم دا هەودای باسەکە بگۆڕم.

لێم پرسی: «کار و داهات چۆنە؟

لێوی مێمێ بزەیەکی پڕ لە غەم و بێ دەنگی تێ زا، وەك ئەوەی دەروونی لە هەموو هەستێك بەتاڵ بووبێت، وەك ئەوەی ئەوەندە لە مێژ بێ پێکەنی بێت، تامی پێکەنینی لە بیر چووبێتەوە. سەری بە شێوەیەکی ڕەمزاوی لەقاند و گوتی: «ئەوەیە کە دەبینی... !» ئیتر سەری داخست و بێدەنگ بوو.

جوان بیرمە ئەو کاتەی هاتمە دەرێ، قاپی چێشتەکەم دایەوە دەست مێمێ، بێ ئەوەی پێی بڵێم لەبەر چی لێوم لێ نەداوە، هەستاو قاپەکەی لە سەر جێ قاپەکان دانا و هەر لەوێوە چاوێکی لێ کردم و دیسان

گوتبیەوە: «لەگەڵ دایکت دا دەڵێی سێویکن و لە ناوەڕاستدا قاشیان کردوون.

لەوانەیە من لە پێشدا لە بەر تیشکی چراکە دانیشتبێتم و شەوقەکە لە پشت سەرمەوە بووبێت و سێبەرەکە سەروچاوی داپۆشیبێ و لەبەر ئەوە لەو ماوەدا کە قسەی بۆ دەکردم، نەی توانیبێ بە جوانی ڕووخسارم ببینێ. دیسان گەڕایەوە لە سەر جێگاکەی خۆی دانیشتەوە. ئەو وەختەی دایکم بۆ یەکەم کەڕەت پێی نایە سەر خاکی ماکاندۆ، یەکسەرە لە سەر پشتی هێسترەکە دایان گرتبوو بردبوویانە سەر کورسییەك دایان نابوو. سێ مانگی عەلەن تەواو لەو شوێنەدا کەوتبوو، بێ ئەوەی لەو شوێنە بزوابێ، زۆر بە بێ ئیشتیاییەوە نان و چایەکەی خواردبوو. زۆر جار دوای ئەوی نانی نیوەڕۆیان بۆ بردبوو ئەو تا دەمەو ئێوارە قاپەکەی گرتبوو بە دەستییەوە و لە سەر جێگای خۆی وشك ببوو، بێ ئەوەی جووڵەی کردبێ، لاقەکانی بە کورسییەکەوە دەنا و لە قووڵاییی دەروونی دا هەستی بە مردن دەکرد، هەتا کەسێك دەهات و قاپەکەی لە دەست وەردەگرت. کاتێك ژانی منداڵبوون تەنگی پێ هەڵچنی، ئازار بزواندی و لە تەنیاییی هێنایە دەرێ و هەستا و لە سەر پێی خۆی ڕاوەستا. ماوەی نۆ مانگ لە نێو پەنجەکانی مردندا و بە دەم ئازار و جەزرەبەوە ژیابوو، ناچار بوون یارمەتیی بدەن هەتا ئەو بیست هەنگاوەی نێوان بەرهەیواەکە و ژووری نووستنەکە ببڕێت.

ئەو ئازار و ماندوو بوون و سەختییەی لە نێوان گۆڕینی ئەو دوو شوێنەدا، یانی لە بەر هەیوانەکەوە هەتا سەر قەنەفەی ژووری نووستنەکە

کێشابووی، لە درێـژاییی سـەفەرەکەی دوو سـێ مـانگ لـەوە پێشـدا هـەر هەستی پێ نەکردبوو، بەڵام بەر لەوەی دەوری خـۆی لـە بەشـی کۆتـاییی شـانۆی ژیانـدا بگێڕێـت، گەییشـتە ئـەو شـوێنەی چـاوەڕوانی دەکـرد و دەیشیزانی دەیگاتێ.
مێمێ دەیگوت بابم بە ڕواڵەت بـە مردنـی دایکـم غـەمبار بـوە، بـەڵام هـەر وەك خۆی پاشان بۆی گێڕابوونەوە، ئەو کاتەی لە ماڵێـدا تـەنیا مایـەوە، گوتی: «ئەو ماڵەی کە پیاوەکەی ژنێکی شەرعی و یاسـایی نـەبێ، کـەس متمانەی پێ ناکات. . لەبەر ئەوە لە شوێنێکدا خوێندبوویەوە ئەو کاتەی خۆشەویستێك دەمرێ، دەبێ جێوبانێك لە گـوڵی یاسـەمەن سـاز بکـەیت، هـەتا هـەموو شـەوێك بـە خـەو ببیـنی. هـەر لەبـەر ئـەوە دارێکـی مێـوی چەقاند و بە دیوارەکەی ئەو بەردا هـەڵی واسـی و دوای سـاڵێك، سـەر لـە نوێ زەماوەندی کردەوە و لەگەڵ ئادێلایدای زڕدایکمدا ژیانی هاوبەشـیان پێك هێنا.
جاری وا بوو هەستم دەکرد مێمێ بـە دەم قسـەکردنەوە خەریکـە دەسـت بکات بە گریان، بەڵام لەبەر ئەوەی سەردەمێك بەختەوەر بوە، ئێستا بـە مەیلی خۆی پشتی تـێ کـردوە، ددانـی بـە جـەرگی دا دەنـا و نـەدەگریا، پاشان بزەیەکی هاتێ و پـاڵی دا بـە کورسـییەکەی خۆیـەوە و بـوەوە بـە مێمێ خوێنشیرین سەرووخۆشەکەی جاری جاران.
کاتێك قیـت دانیشـت، کەوتـەوە بـیری ئـەوەی هێشـتا گـەلێك بیرەوەریـی شیرینی لە دڵی خۆی دا هەڵ گرتـوە و بـەو خۆشەویسـتییە بـێ سـنوور و دەروونە پاك و دڵە سافەیەوە بزەیەکی شیرین نیشتە سەر لێـوی. پاشـان

گوتی دوای پێنج ساڵ ڕووداوێکی تازە ڕووی دا. ئەو دەهاتە دیوی نانخواردنەکە و ئەو کاتەی بابم لەوێ خەریکی نانخواردن بوو پێی گوت: «سەرهەنگ... سەرهەنگ... کەسێکی غەوارە هاتوە، لە نووسینگەکەت چاوەڕوانە هەتا چاوی بە تۆ بکەوێت .



پێشتر لەو بەری شەقامەکەوە لە پشت کڵێسا، پەڵە زەوییەکی بەیاری لێ بوو، لە کۆتاییەکانی سەدەی پێشوودا، ئێمە ئەو کاتە تازە هاتبووینە ماکاندۆ و هێشتا دەستیان بە سازکردنی کڵێسا نەکردبوو، ئەم پەڵە زەوییە بەیارە و وشك و بێ دار و گیا و ڕووتەن بوو، ئەو کاتە منداڵان دوای قوتابخانە و لە کاتی پشووداندا لەوێ یارییان دەکرد. پاش ماوەیەك، ئەو کاتەی دەستیان کرد بە سازکردنی کڵێسا، چوار کۆڵەکەیان لە بەشێك لەو زەوییەدا چەقاند، دیار بوو ئەو شوێنە دەوور دراوە و دیاری کراوە بۆ ئەوەی دیوێکی تێدا ساز بکەن، پاشان دیوێکی چکۆڵەیان تێدا ساز کرد، هەتا بیکەنە شوێنێك بۆ عەمباری ئەو پێداویستییانەی بۆ سازکردنی کڵێساکە دەیهێنن و لە بەرەوە کەڵکی لێ وەردەگرن.

کاتێك کاری سازکردنی کڵێساکە کۆتایی هات، کەسێك هات و دیوارە خشتییەکەی ئەو چادراخەی بەرز کردەوە و لە ڕووکاری پشتەوەی کە دەیڕوانییە ئەو پەڵەزەوییە بەیارە، دەرگایەکی تێ کرد. لە نێو ئەو زەوییەدا تەنانەت چڵەگیایەکیش شین نەببوو. سازکردنی ئەو چادراخە

چکۆڵە ساڵێکی خایاند. جێگەی حەوانەوەی دوو کەسی تێدا دەبوەوە، نێو دیوەکە پڕ بوو لە بۆنی قسڵ، تەنیا بۆنێکی خۆش بوو لە نێو ئەو دیوەدا بەر لووت دەکەوت و بەردەوام لەوێیشدا مایەوە.

کاتێك لە کاری گەچکاریی دیوارەکان بوونەوە، هەر ئەو دەستەی دیوارەکانی دانابوو، قوفڵێکی بۆ دەرگاکەی پشتەوە ساز کرد و لێی دا. ماڵەکە خاوەنێکی تایبەتیی نەبوو، کەسێك ئامادە نەبوو ئەوەندە خۆی ماندوو بکات و ئەو پەڵە زەوییە لەگەڵ ئەو شتانەی تێی دا بوون، بە نێوی خۆیەوە تاپۆ بکات. کاتێك یەکەم قەشەی ئەو ناوچەیە پێی نایە شارۆچکەکەوە، لەگەڵ یەکێك لە بنەماڵە سامانداڕەکانی ئەوێدا، بناغەی دۆستایەتیی داڕشت، بەڵام لەو کاتەدا ژنێك لەگەڵ منداڵێکی بەرمەمکان لەو ماڵەدا دەژیان، هیچ کەسێك نەی دەزانی ئەو ژنە لە کوێوە هاتوە و چۆن توانیویەتی دەرگای ئەو دیوە بکاتەوە.

لە قوژبنێکی ئەو چادراخەدا گۆزەیەکی گڵی دوکەڵاویی قەوزەگرتووی لێ بوو، شووشەیەکی دەمداچەقاویش بە سنگێکەوە بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو. ئاوی باران سەر بەردی حەوشەکەی بە توێژاڵێك گوڵی وشکهەڵاتوو داپۆشیبوو. ژنە بۆ پاراستنی خۆی لە تیشکی هەتاو، ساباتێکی لە چرپی و چاڵ ساز کردبوو. لە بەر ئەوەی هیچی بە دەستەوە نەبوو، هەتا میچێك لە گەڵای خورما و ئەشیای تر دروست بکات. لە پەنای ساباتە چرپییەکەی دا دارمێوێکمی چەقاند و نانێکی بە ڕووکاری دەرەوەی ئەو دەرگایەی ڕوو بە شەقامەکە دەکرایەوە هەڵواسی، هەتا لە شەڕی شەیتان و بەڵای ناگەهان بیپارێزێ.

کاتێـك هـاتنی قەشـە لـە سـاڵی ١٩٠٣ـدا ڕاگەیـەنرا، ژنـە هێشـتا لەگـەڵ منداڵەکەی دا لە نێو ئەو ماڵەدا دەژیا، کۆمـەڵێك لـە خـەڵکی شـار بـەرەو ڕێگای سەرەکی کەوتنـە ڕێ، هـەتا لـەوێ چاوەڕوانی هـاتنی قەشـە بـن. تیپـی مۆسـیقای گوندەکـەیش خـەریکی لێدانی کۆپلەیـەکی هەسـتبزوێن بـوون، لـە ناکـاو منـداڵێك بـە هەناسـەبڕکێ و هەڵاتهـەڵات هـات و گـوتی، هێسترەکەی قەشە گەییشیتۆتە سەر کلکەی ڕێگاکە و ئەوەندەی نـەماوە بگاتــە ئێــرە، پاشــان تیپــی مۆســیقا شــوێنگۆڕکێیان کــرد و ئــاوازێکی حەماسییان پێشکەش کرد. ئەو کەسەی بڕیار بوو وتاری پێشوازیکردن لە قەشە بخوێنێتەوە، چوە سەر سەکۆیەك و چاوەڕوان مایەوە، هەتا قەشـە تەشریف دێنێ، بەڵام پاش ماوەیەك لێدانی ئاهەنگـە حەماسـییەکە پچڕا. کەســە وتاربێژەکــە لــە ســەر ســەکۆکە هاتــە خــوارێ و خــەڵك بــە سەرسووڕمانەوە چاویان بە پیاوێکی غەوارە کەوت بە سواری هێسـترێك و چەمەدانێکی گەورەوە، کە هەتا ئەو کاتە ماکاندۆ شـتی وای بـە خۆیـەوە نەدیبوو، هاتە نێو شارەوە. پیاوەکـە بـە نێـو شـاردا تـێ پـەڕی، بـە بـێ ئەوەی بـە سیلەی چـاوێکیش لـەم لاو ئـەو لای خـۆی بڕوانێـت، تەنانـەت ئەگەر قەشەیش بە مەبەستی سەفەر جلوبەرگی ئاسایی لە بەر بکردایـە، هیچ کەسێك بیری لەوە نـەدەکردەوە ئـەو پیـاوە تاوەسـووتە بـەو دۆڵابـە سەربازییانەوە، قەشەیەك بێ و جلوبەرگی ئاسایی لە بەر کردبێ.

لە ڕاستییشدا ئەو قەشە نەبوو، هەر ڕاست لەو کاتەدا، لە گەڕەکێکی تری شارەوە لە ڕێگایەکی سەربڕەوە، خـەڵکی قەشـەیەکی نەناسـیاوی لاواز و ڕێوەڵەیان دیت، لابەلا سواری هێسترێك بوە و داوێنی عەباکەی هەتا سـەر

چۆکی هەڵکردوە، بۆ ئەوەی لە گەرمای هەتاو بیپارێزێت. چەترێکی شەقوشڕۆڵی کردوەتە سێبەری سەری و لە نزیك کڵێسا بە شوێن ماڵی قەشەدا دەگەڕێ. دیارە ئەو کەسەی ئەو هەواڵی ماڵەکەی لێ پرسیبوو، بۆ خۆی ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەببوو، لە بەر ئەوەی پێی گوتبوو: «بابەی ڕۆحانی لە نێو چادراخەکەی پشتی کڵێسادا دەژی.

لەو کاتەدا ژنەکە لە چادراخەکەدا نەبوو، بەڵام منداڵەکە لە نێو چادراخەکەدا، خەریکی یاریکردن بوو، قەشە لە سەر هێسترەکە دابەزی و چەمەدانێکی ئاخنراوی لە نێو چادراخەکەدا دانا. دەرگای چەمەدانەکە قوفڵ نەکرابوو، هەر بە تاڵێك چەرمی باریك بەستبوویان، چاوێکی لە چادراخەکە کرد و هێسترەکەی بەرەو نێو حەسارەکە دەنگ دا و لە ژێر سێبەری چرپی و گەڵای دارمێوێکدا بەستییەوە، پاشان چەمەدانەکەی کردەوە و هەلۆرکێکی لێ دەرهێنا، ئەویش بە دڵنیاییەوە بە ئەندازەی چەترەکەی کۆنە و بە قەدر ئەویش شەقوشڕ بوو. هەلۆرکەکەی لە نێو دیوەکەدا بە نێوان دوو کۆڵەکەدا هەڵواسی، چەکمەکانی لە پێ داکەند و خۆی خستە ئامێزی هەلۆرکەکە و هەوڵی دا بێ سەرنجدان بە منداڵەکە، کە بە سیلەی چاو لێی دەڕوانی، خەوی لێ بکەوێت.

ژنە کاتێك گەڕاوە و قەشە غەوارەکەی بینی، کە ڕووخساری ئەوەندە بێ زەوق و شەوق بوو، هەر لە کاژەڵاکی سەری گا دەچوو بەپەشۆکاوییەوە و بە پێدەزە بە نێو دیوەکەدا تێپەڕی بوو، قەنەفەکەی خۆی هەتا بەر دەرگاکە بە کێش کردبوو، جلەکانی خۆی و پەڕۆوپاڵی منداڵەکەی کۆ کردبووەوە و بێ ئەوەی نیگەرانیی گۆزەکە و شووشە دەمداچەقاوەکەی

بێ، لە چادراخەکەوە دەرکەتبوو. پاش چەند کاتژمێرێك، کاتێك دەستەی نوێنەران بە دوای تیپی مۆسیقادا و لە ڕێگایەکی ترەوە بەرەو شار گەڕانەوە، چاویان بە قەشە کەوت کە دوگمەکانی عەباکەی کردبووەوە و چەکمەکانی لە پێ دەرهێنابوو بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە، بە تاقی تەنیا، لە سەر هەلۆرکەکەی خۆی لە نێو چادراخەکەدا خەوی لێ کەوتوە. دیارە کەسێك ئەم هەواڵەی پێ دابوو، بەڵام هیچ کەسێك بیری لەوە نەکردبووەوە قەشە لە نێو ئەو چادراخەدا چی دەکات.

لەوانەیە بیریان لەوە کردبێتەوە ڕەنگە لەگەڵ ئەو ژنەدا پێوەندی و خزمایەتییەکیان بە یەکەوە هەبێ. ژنەکەیش لەوانەیە بەو هۆیەوە ئەو چادراخەی بە جێ هێشتبێت و پێی وا بوە قەشە فەرمانی داگیرکردنی ئەو شوێنەی پێ بێ، یان ئەو شوێنەیش بەشێك بێ لە موڵکی کڵێسا، لەوانەیە لەوەیش ترسابێ، نەکا لێ پرسینەوەی لەگەڵدا بکەن و بڵێن تۆ بە چ مافێك دوو ساڵ لە شوێنێکدا ژیاویت، کە هیچ مافێکت بە سەرییەوە نەبوە، بە بێ ئەوەی ئیزنت وەرگرتبێ، یان کرێت دابێ، بە هیچ شێوەیەك بە مێشکی دەستەی نوێنەراندا تێ نەپەڕی، نە ئەو کاتە و نە دوای ئەوەیش، کە ئەو پرسیارەی لێ بکەن. قەشە هەر ئامادە نەبوو گوێ لە بەخێرهێنانەکەیشیان بگرێت، هەر سەلاوێکی سارد و بەپەلەی لێ کردن و دیارییەکانی لێ وەرگرتن و لە سەر ئەرزەکە لە چادراخەکەدا دای نان. پێشتر پێی گوتبوون کە شەوی پێشوو هەتا بەیانی چاوی لە سەر یەك دا نەناوە.

ئەندامانی دەستە نوێنەرایەتیی پاش ئەو سەلاوە سارد و بێ وێنەیەی قەشە، بلاوەیان پێ کرد. ئەوان زۆر بە سەرنجەوە هەولیان دا لە ڕووخساری بڕوانن، کە بەو قژە سەرە سپییە کورتەیەوە، هەر لە کاژەلاکی سەری گا دەچوو، کە بە وردی سەرنجیان دایە و لێیان ڕوانی، دیتیان لێوی نەبوو، بەلکوو لە جێگای لێو قەلەشێکی بە شێوەی ئاسۆییی تێدایە، زۆر لەوە دەچوو لە کاتی لەدایکبوونی دا، دەمی نەبووبێ و پاش ماوەیەك بە چەقۆیەکی تیژ و تایبەت بۆیان ساز کردبێت. بەلام دەمە و ئێوارەی هەمان ڕۆژ هەستیان کرد ئەو شێوەی کەسێك دەدا، بەر لەوەی هەتاوی ڕۆژی دواتر لە ئاسۆوە سەر دەر بێنێ، هەموو دەیانزانی ئەو کەسە کێیە. کەوتەوە بیریان ئەو سەردەمەی کە ماکاندۆ گوندێکی خنجیلانە بوو، ئەویان بە ڕووتی، بەلام بە پێلاو و کلاوەوە، بە تیروکەوانەوە دیبووج سەربازە دێرینەکان ئەویان لە شەڕی ناوخۆییی ١٩٥٥ باش لە بیر بوو، ئەو پیاوە لە تەمەنی حەڤدە سالی دا خاوەن پلەی سەرهەنگی بوە.

ئازا و نەترس و بوێر بوو، لەگەل حکوومەتدا ناکۆکییان بوو، بەلام ئیتر لە بابەت ئەوەوە هیچ باسێکیان نەبیست، هەتا ئەو ڕۆژەی گەڕایەوە بۆ نیشتمان و کاری قەشەییی ئەو ناوچەی گرتە ئەستۆ، ژمارەیەکی کەم ناوەکەیان لە بیر مابوو– لە بەر ئەوەی قیرەون و شەڕانی بوو– هاوتەمەنەکانی نێویان نابوو «تولەسەگ» هەتا کاتی مردنیشی ئەوەندەی لە ماکاندۆدا ژیا، هەر هەرایان لێ کرد: «تولەسەگ .

£

٤

هەر ڕاست لەو سەروبەندە و لەو ڕۆژە و لەو کات و ساتەی تولەسەگ پێی نابوە نێو ماکاندۆوە، ئەویش خۆی کرد بە ماڵی ئێمەدا. ئەم پیاوە نەناسراوە، بێ ئەوەی کەس چاوەڕوانی بێ و بێ ئەوەی هیچ کەسێك نێوەکەی بزانێ، یان کەمترین ئاگاداری لە کار و پیشەی هەبێ. لەو ڕێگا سەرەکییەی بڕیار بوو قەشەی پێدا بێتە ماکاندۆوە، خۆی کرد بە نێو شاردا و قەشەیش کە تەواوی خەڵکی شار لەوێ چاوەڕوانی بوون، لە ڕێگایەکی لاوەکی و سەربڕەوە، خۆی کرد بە نێو شاردا.

من لە پاش ڕێوڕەسمی پێشوازیکردن، هاتمەوە بۆ ماڵێ، تازە لە پشت مێزەکە دانیشتبووم، هەندێك درەنگتر لە ڕۆژانی تر- مێمێ بە هەڵەداوان هاتە ژوورەوە و گوتی: «بەڕێز سەرهەنگ، بەڕێز سەرهەنگ، بەڕێز سەرهەنگ... کەسێك هاتوە و لە نێو نووسینگەکەدا چاوەڕێتانە.

پێم گوت: «پێی بڵێن تەشریف بێننە ژوورەوە.

مێمێیش وەڵامی داوە و گوتی: «لە نووسینگە دانیشتوە و دەڵێ دەبێ زۆر زوو چاوی بە تۆ بکەوێت.

ئادێلایدا، خەریك بوو سوبی دەکرد بە دەمی ئیزابێلەوە، دەستی هەڵگرت و (لەو کاتەدا ئیزابێل پێنج ساڵانە بوو) چوو بە لای میوانەکەوە، هەتا هەست بەغەریبی نەکات. پاش ماوەیەك گەڕایەوە، هەستم کرد شڵەژاو و نیگەرانە، گوتی: «لە نێو نووسینگەکەدا دێت و دەچێ.» ئادێلایدا لە پشت مۆمدانەکانەوە هات و سەر لە نوێ دەستی کردەوە بە سوبدان بە

ئیزابێل، منیش بە دەم نانخواردنەوە. گوتم: «دەبوو خوڵکت بکردایەت بێتە ژوورەوە.

ئەویش گوتی: «منیش هەر ویستم بێتە ژوورەوە، بەڵام کاتێك چوومە ئەوێ، بە نێو دیوەکەدا هاتوچۆی دەکرد، تەنانەت وەڵامی سەڵاوەکەیشی نەدامەوە. لەبەر ئەوەی چاوی بڕیبوە ئەو بووکەڵەی وا لە سەر مێزەکە دانراوە، کاتێك ویستم دیسان سەڵاوەکەم دووبارە بکەمەوە، بووکەڵەکەی قورمیش کرد و لە سەر مێزەکە دای ناوە و چاوەکانی تێ بڕین، پێم وا بێ دەنگی شەپۆلی مۆسیقاکە نەی هێشت گوێی لە سەڵاوەکەم بێت. لە بەر ئەوەی من لە لای مێزەکە ڕاوەستابووم و ئەویش سەری داخستبوو، چاوی لە بووکەڵەکە دەکرد.

ئادێلایدا خەریك بوو سوبی بە دەمی ئیزابێلەوە دەکرد، پێم گوت: «لەوانەیە بووکەڵەکە بە لایەوە شتێکی سەیر بووبێ.

ئەویش لە وەڵامم دا گوتی: «بە نێو نووسینگەکەدا هەر دەهات و دەچوو، کاتێك چاوی بە بووکەڵەکە کەوت، لە جێگەکەی خۆی هەڵی گرت و لەسەر ئەرزەکە دای نا، هەر دەتگوت لە پێشدا دەیزانی بە کاری چی دێ. لەوانەیە شێوەی کارکردنەکەی زانی بێت، کاتێك بۆ یەکەمین جار سەڵاوم لێ کرد، خەریك بوو بووکەڵەکەی قورمیش دەکرد، پاشان لە سەر مێزەکە دای نا و دەستی کرد بە سەیرکردنی، بەڵام نە بزەیەکی هاتە سەر لێوی و نە وتەیەك بە زاری دا هات. سەماکردنەکەی پێ گرینگ نەبوو، بەڵکو شێوازی کارکردنەکەی بە لایەوە گرینگ بوو.

قەت لە هاتنی کەسێك ئاگاداریان نەدەکردمەوە، بەردەوام هەموو ڕۆژێك میوانمان هەبوو، زۆربەی ئەوانە میوانگەلێکی ناسیاو بوون و دەهاتن و ئەسپەکانیان لە نێو بەهاربەندەکەدا دەبەستەوە و بە تێڕادیوییەوە خۆیان دەکرد بە ژووردا، ئێمەیش هەر بەو سەروڕووخۆشییەی ئەوان چاوەڕوانی بوون، سفرەمان بۆ ڕادەخستن و لە لای خۆمانەوە جێمان بۆ دەکردنەوە، بە ئادێلایدام گوت: «بە دڵنیاییەوە پەیامێکی تایبەتی پێیە.

ئەویش گوتی: «ئەوەی جێی سەرنجە، هەڵسوکەوتێکی سەیر و تایبەتی هەیە، هەموو سەرنجی خۆی دابوە سەر بووکەڵەکە، هەتا قوڕمیشەکەی تەواو بوو، منیش هەر لەوێ بووم، نەم دەزانی چ بکەم، لە بەر ئەوەی دەمزانی هەتا ئەو کاتەی دەنگی ئاوازەکە ئاوا لە سەرێ بێ، گوێم ناداتێ. پاشان کاتێك بووکەڵەکە سەبرێك لە جێگەی خۆی بزووت، وەك ئەو کاتانەی قوڕمیشەکەی تەواو دەبێ، هێشتا هەر بە پێوە ڕاوەستابوو، بە چاوە زەقەکانییەوە لێی ڕامابوو. دانەنیشتبوو، بەڵکو بە سەر مێزەکەوە نووشتابوەوە، پاشان چاوێکی لە من کرد، ئەو کاتە هەستم کرد دەزانێ منیش لە نێو نووسینگەکە دام، بەڵام هیچ بایەخێك بۆ من دانانێت، ئەوەی بە لای ئەوەوە گرینگ بوو ئەوە بوو، بزانێت سەماکردنی ئەو بووکەڵەیە چەند خوولەك دەخایەنێت، ئیتر سەلاوم لێ نەکردەوە، بەڵکوو کاتێك چاوی لێ کردمەوە، بزەیەکم هاتێ. لە بەر ئەوەی پێم وابوو بە هۆی ئەو چاوە گەورانە و ئەو گلێنە زەردانەیەوە دەتوانێت مرۆڤێکی گەورە هەڵ لووشێ و قووتی بدا. کاتێك ئەو بزەم هاتە سەر

لێو، هەر وا بە هەیبەتەوە لە سەر جێگاکەی خۆی ڕاوەستابوو. پاشان بە شێوەیەکی فەرمی، سەرێکی لەقاند و گوتی: «سەرهەنگ، من دەبێ چاوم بە سەرهەنگ بکەوێت . بە حاڵەحاڵ دەنگیم دەبیست، دەتگوت لە بنی بیرێکی قووڵەوە دەنگی دەگاتە گوێم، وەك ئەوەی بتوانێت، بە دەمی بەستراویشەوە قسە بکات. هەر دەتگوت لەو کەسانەیە لە نێو زگیانەوە قسە دەکەن.

هەر وا کە سوبی دەکرد بە دەمی ئیزابێلەوە، درێژەی دایە و گوتی: «کاتێك چووم، بە نێو نووسینگەکەدا دەهات و دەچوو.

لەو کاتەدا بیرم لەوە دەکردەوە ئەوغەوارەیە زۆر شوێنی لە سەر ئادێلایدا داناوە و پێی خۆشە زوو بزانێ من چۆن لەگەڵی دا دەجووڵێمەوە، بەلاَم من هەموو هۆشم بە لای خواردنەکەمەوە بوو. ئەویش سوبی دەکرد بە دەم ئیزابێلەوە قسەی دەکرد و دەیگوت: «پاشان گوتی، دەمەوێ چاوم بە سەرهەنگ بکەوێ. خولکم کرد و گوتم، تکایە تەشریف بهێنە بۆ ژووری نانخواردنەکە، بەلاَم ئەو لە سەر جێگاکەی خۆی ڕەق ڕاوەستابوو، بووکەڵەکەی گرتبوو بە دەستییەوە. پاشان سەری هەڵهێناوە وەك سەربازێك ڕەپ ڕاوەستا. هەر لە بەر ئەوەی چەکمەی لە پێ دابوو، جلوبەرگەکەی لە پارچەی ئاسایی دروابوو، کراسەکەیشی هەتا بن ملی دوگمەی پێوە بوو، پێم وابوو سەربازە. کاتێك هیچ وەلاَمێکی نەدامەوە و بێ دەنگ ڕاوەستا، نەم دەزانی چ بڵێم. هەر دەتگوت چاوەڕوانە من لە دیوەکە بچمە دەرەوە، هەتا دیسان بووکەڵەکە قورمیش کاتەوە!»

بە ئادێلایدام گوت: «تۆ پێت وایە دەبێ شتێکی گرینگ لـە گۆڕێـدا بـێ؟»
لە سەر جێمۆمەکانەوە چاوم لێ دەکرد، ئـەویش چـاوی لـە مـن دەکـرد و
سوبی دەکرد بە دەمی ئیزابێلەوە. گوتی: «کاتێك چـوومە نووسـینگەکە،
لەبـەر ئـەوەی بـە نێـو دیوەکـەدا دەهـات و دەچـوو سەروچـاویم نـەدیت،
پاشان کاتێك لە دوورەوە ڕاوەستا، بە شێوەیەك سەری ڕاگرت و وای چاو
لێ کردم پێم وابوو کەسێکی سەربازییە، هەر بۆیە پێم گوت: «دەتەوێ بە
شێوەیەکی تایبەت چاوت بـە سـەرهەنگ بکـەوێت؟ مەبەسـتت ئەوەیـە؟»
ئەو بە سەر وەڵامی دامەوە، پاشان هاتمەوە بۆ ئێرە هەتا پێت بڵـێم ئـەو
لە کێ دەچێ، یان باشترە ئاوا بڵێم ئـەو هـەر ئـەو کەسـەیە شـێوەی لـەو
دەچێ. سەرەڕای ئەوەیش نازانم ئەو چۆن لێرە سەری دەرهێناوە.
من هەر وا خەریکی نانخواردنی خۆم بووم و لە سەر جێمۆمەکانەوە چاوم
لەو دەکرد، دەستی لە سوبەکە هەڵگرت و گـوتی: «دڵنیـام هـیچ پـەیامێك
لە گۆڕێدا نییە، قسە لە سەر ئەوە نییە ئەو لە کێ دەچـێ، بـەڵکوو ئـەوە
گـرینگ و جێـی سـەرنجە، ئەمـە ڕاسـت هـەر ئـەو کەسـەیە شـێوەی ئـەو
دەدات، دڵنیـام. هــەر وەك ئـەوەی، کـە دڵنیـام پیـاوێکی سـەربازییە،
سمێڵێکی قیت و ڕەشی پێوەیە، ڕەنگی ڕووخساری هەر لـە ڕەنگـی مـس
دەچێ و جووتێك چەکمەیشی لە پـێ دایـە، دڵنیـام ئـەو شـێوەی کەسـێك
دەدا.

یەکدەنگ و بەردەوام بێ ئـەوەی دەنگـی بـەرزی و نزمـی بکـات
قسەی دەکرد. هەستم بە گەرمیی هەوا دەکرد، لەوانەیە هەر لەبـەر ئـەوە

بووبێ، بەرەبەرە خەریك بوو تووڕە دەبووم. پێم گوت: «دەی ئەگەر وایە لە کێ دەچێ؟

ئەو لە وەڵامـدا گوتی: «ئەو کاتەی دەچوومە نێو نووسینگەکە و دەهاتمەوە دەرێ نەم توانی بە جوانی ڕووخساری ببینم، بەڵام دوایی دیتم.

لە دووپاتکردنەوەی قسەکانی ماندوو ببووم، گوتم: «زۆر چاکە، زۆر چاکە. ئەگەر نانەکەم خوارد دەچم دەیبینم.» ئەو دیسان دەستی کردەوە بە سوبدان بە ئیزابێل و گوتی: «لە سەرەتاوە سەروچاویم نەدی، لەبەر ئەوەی بەردەوام لە هاتوچۆدا بوو، بەڵام ئەو کاتەی ئارام لە پاڵ دیوارەکەدا ڕاوەستا، هەر ڕاست لەو کاتەدا کەوتەوە بیرم ئەو شێوەی یەکێ دەدات و هاتم بۆ ئێرە هەتا بە تۆ بڵێم... چاوە زەق و حیزەکانی داوێنپیسی و زەنەکییان لێ دەباری، کاتێك پشتم تێ کرد هەتا بێمە دەرەوە. هەستم کرد زەقزەق چاوەکانی بڕیوەتە پووزە ڕووتەکانم و زیت زیت لێیان دەڕوانێت.

ئیتر لەناکاو بێدەنگ بوو.

لە دیوی نانخواردنەکە دەنگی کەوچك دەهاتە گوێم. نەهارەکەم خوارد و دەسڕە دەستەکەم قەد کرد و نامە ژێر دەورییەکەم، لەو کاتەدا لە نێو نووسینگەکەمەوە دەنگی ئاهەنگێکی شاد لە بووکەڵە قوڕمیشییەکەوە هەستا و وردە شەپۆلەکانی ڕژایە نێو دیوەکەی ئێمەیشەوە.



کورسـییەکی قــەدیمی و بــە نیگــار نەخشــێنرا و لــە نێــو چێشتخانەکەمان دایە، بابەگەورەم پێڵاوەکانی خۆی لە سەر دادەنێ هەتا وشك بنەوە. من و ئیبراهام و توبیاس[7] و گلبرتۆ[8] دوێنێ ئەم دەمانە لە قوتابخانــە دەرکــەوتین و بــە قۆچــەقانییەك و کلاوێکــی گــەورە بــۆ کۆکردنــەوەی پەلــەوەر و چــەقۆیەکی تــازە و تیــژەوە، بــۆ ڕاوکــردن و کوشـتنی باڵنـدەکان چـووین بـۆ مـەزرا، لـە نێـو ڕێـدا کەوتمـە بـیری ئـەو کورسییە کۆن و بێکەڵکەی لە نێو چێشتخانەکەمان دایە، سەردەمێك ئـەو کورسییە بۆ میوانەکان بە کەڵك بوە و ئێسـتا هـەموو شـەوێك ئـەو تەرمـە کلاو لە سەر دەنێ و لـە سـەری دادەنیشـت و چـاو لـە چـاوی خۆڵەمێشـە ساردەکەی نێو ئاگردانەکە دەبڕێ.

توبیاس و گیلبرتۆ، خەرامان خەرامان دەڕۆیشتن و گەییشتنە ئـەو سـەری ڕەزەکان. پێشنیوەڕۆ بارانێکی زۆر خەست و خۆڵ بارییبوو، پێڵاوەکانیان

---

[7] tobias

[8] gilberto

بە سەر گژوگیاکاندا دەخلیسکا، یەکێکیان فیکەی لێ دەدا و دەنگی بە سۆز و بەرزی فیکەلێدانەکەی، وەك ئەو کاتەی یەکێك لە نێو بۆرییەکدا گۆرانی بڵێ، بە نێو داڵانە سەوزەکەدا دەنگی دەدایەوە. من و ئیبراهام لە پشتە سەرییانەوە یارمەتیمان دەدان، ئەو بە قۆچەقانی و منیش بە چەقۆ تیژەکەمەوە، کە دەمەکەی هەر بریسکەی دەهات. لە ناکاو تیشکی هەتاو چرپی و گەڵا چڕەکانی بە توندی لە بەر یەك ڕەواندەوە و شتێکی سووك، هەر لە باڵندەیەکی زیندوو دەچوو، بە باڵەفڕکێ کەوتە سەر گژوگیاکان. ئیبراهام پرسیی: «ئەوەت بینی؟
من چاوم لە پێش خۆم بوو، گلیبرتۆ و توبیاسم لەو سەری داڵانەکەدا دی و گوتم: «نا، باڵندە نەبوو... بریسکەی تیشکی هەتاو بوو.
کاتێك گەیشتنە لێواری چۆمەکە، ئەوان خۆیان ڕووت کردەوە و لاقەکانیان بە توندی بە ئاوە زوڵاڵەکەدا دەکێشا، بە ڕواڵەت ئاوەکە تەڕی نەدەکردن، ئیبراهام گوتی: «لە نیوەڕۆوە هەتا ئێستا، تەنانەت تاقە باڵندەیەکیشم نەدیوە.
من گوتم: «کاتێك باران دەبارێ، هیچ پەلەوەرێك لە هێلانەکەی دەر ناکەوێ.» باوەڕم بە قسەی خۆم کرد، ئیبراهام کەوتە پێکەنین... زۆر گەمژانە پێدەکەنی و دەنگی پێکەنینەکەی هەر لە دەنگی خووڕەی ئەو ئاوە دەچوو بە لوولەی ئاودەستەکاندا شۆڕ دەبێتەوە و دەچێتە خوارێ.
خۆی ڕووت کردەوە و گوتی: «ئەو چەقۆیە لەگەڵ خۆم دەبەمە نێو ئاوەکەوە و کڵاوەکەم پڕ دەکەم لە ماسی.

ئیبراهام بـه ڕووتوقوتییـەوە ڕووبـەڕووم ڕاوەسـتا بـوو، دەسـتی بـۆ درێـژ کردبـووم، چـاوەڕوانی چـەقۆکە بـوو، مـن هێشـتا وەڵامـم نـەدابووەوە، چەقۆکەم توند ڕێك دەگوشی و هەستم بە دەمە تیژەکەی لە نێـو دەسـتم دا دەکرد، لە دڵـی خـۆم دا گـوتم، چاکتر وایـە چـەقۆکەی نـەدەمێ، پـێم گوت: «چەقۆکەمت نادەمێ... ئەو چەقۆیەیان دوێنێ داوەتە دەست من و دەمەوێ هەتا ئێوارە هەر بە دەستی خۆمەوە بێ.

ئیبراهام، هەر وا دەستی ڕاگرتبوو، پێم گوت:

«نەزە، ئەزە، یەزە، دەزە، هەزە، مەزە.

ئیبراهام لێم حاڵی بوو، ئـەو تـەنیا کەسـێکە زوو لـە قسـەکانم تـێ دەگـا، گوتی: «زۆر چاکە، بە نێو هەوا شێدارە چەقبەستوە بۆگەنەکـەدا بـەرەو ئاوەکـە کەوتمـە ڕێ، گـوتی: «وردەوردە خـۆت ڕووت بکـەوە، لـە سـەر ڕەوەزەکان چاوەڕوانتم.

ئەوەی گوت و خۆی هەڵدایە نێـو ئاوکـەوە، هـەر لـە ماسـییەکی گـەورەی زیوین دەچوو، من لـە لێـواری ئاوەکـەدا مامـەوە و لـە سـەر خیـز و ڕمڵـە گەرمەکان ڕاکشـام. کاتێـك دیسـان دەمـی چـەقۆکەم دەرهێنـا، چـاوم لـە ئێبراهام دزییەوە و سەرنجم بەرەو شوێنێکی تـر بـە ڕێ کـرد، بـەرەو لای دارەکان، بەرەو هـەتاوی زەردهەڵگـەڕاوی دەمـەو ئێـوارە، ئـەو شـوێنەی ئاسمانەکەی هەر لە دێوێکی بە سامی ئاورین دەچوو.

ئیبراهام لەو بەرەوە هەرای کرد و گوتی: «زوو بکە درەنگە.»

تووبیاس لە لای ڕەوەزەکـەوە فیکـەی لـێ دەدا ولـە دڵـی خـۆم دا گـوتم: «ئەمڕۆ مەلە ناکەم... هەڵی دەگرم بۆ ڕۆژێکی تر!

لە گەڕانەوەدا ئیبراهام لای دا و چوە پشت دارەکان، ویستم بە شوێنی دا بڕۆم. گوتی: «مەیە بۆ ئێرە... کارم هەیە.

لە جێی خۆم دا مامەوە و لە سەر گەلا و گژوگیا وشکەڵەکەی قەراغ ڕێگاکە دانیشتم. سێرووییەکی تەنیام دی کە بە ئاسماندا هەڵدەفڕیٚ و هێڵێکی لار و پێچەڵاوپێچی دەکێشا، لە بەر خۆمەوە گوتم: «ئاخرییەکەی ئەم دوانێوەڕۆیە چاوم بە سێروویەك کەوت.

ئیبراهام وەڵامی نەدامەوە، لە پشت دارەکانەوە بێدەنگ ڕاوەستابوو، وەك ئەوەی هەر گوێی لە دەنگی منیش نەبووبێت. لەوانەیە خەریکی خوێندنەوەی شتێك بوو بێت. بێدەنگییەکەی زۆری درێژەکێشا، پاش بێدەنگییەکی زۆر هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «تەماشاکە ئەو هەموو سێروە.

دیسانەوە گوتم: «ئەم دوانیوەڕۆیە هەر سێرووییەك بە ئاسماندا هەڵدەفڕیٚ.

ئیبراهام هێشتا هەر لە پشت دارەکاندا بوو، بەلاّم نەم دەزانی چ دەکات، مات و بێدەنگ بوو، سەرەڕای بێدەنگییەکەی لە بەر خۆیەوە دەجووڵایەوە، لە ئازای ئەندامی دا هەست بە بێقەراری دەکرا.

–«هەر دانەیەك؟ بەڵیٚ، ڕاست دەکەی... ڕاست دەکەی

ئیتر من هیچم نەگوت، لە سەر گەلاّ و گژوگیا وشکەکان دانیشتبووم و گوێم لە خشەخشی گەلاّ و گژوگیا وشکەکانی تری ژێر پێی ئەو بوو، دیسان بێدەنگ بوو، هەر دەتگوت ڕۆیشتوە و لەویٚ نەماوە، پاشان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: «لەگەڵ منت بوو؟

دیسان گوتمەوە: «ئەم دوانیوەڕۆیە هەر سێرووییەك بە ئاسماندا هەڵدەفڕێ.» دەنگی باڵەکانیم دەبیست، بە دەم فڕینەوە بازنە لە سەر بازنە دەکێشێتەوە و پێچ دەخوات و بە ئاسمانی شینی دڵگیرا دەسووڕێتەوە.» گوتم: «لەوانەیە لە چاو ون بێت.»

ئیبراهام ئازا وەڵامی دامەوە و گوتی: «ئەها... بەڵێ. ئەگەر وا بێ ئەوە هۆکارەکەیەتی.

هەر وا کە لە پشت دارەکانەوە دەهاتە دەرێ، خەریك بوو دوگمەکانی دادەخستەوە، سەری هەڵبڕی بوو چاوی لە سێروەکە دەکرد و بێ ئەوەی چاو لە من بکات، گوتی: «ماوەیەك لەمەو پێش لە بابەت ئەو سێروانەوە دەتگوت چی؟

بە قسەکردنەوە خافڵا بووین... چراکانی شار، پێیان دەگوتین کاتی ئەوەیە بەرەو ماڵ ببینەوە. چراکان هەڵکرابوون و دەبریسکانەوە، بە پەلە گەڕامەوە بۆ ماڵێ و چوومە ژوورەوە و لە بەر هەیوان چاوم بە ژنە قەڵەوە حافزەکان کەوت، ئاواڵداوانەکەی سێن خێرۆمێیان پێ بوو، بە وتەی دایکم، لەو کاتەوە من لە دایك بووم، هەموو سێشەممانەیەك دێن و گۆرانی بۆ بابەگەورەم دەڵێن. ئەو شەوە هەتا بەیانی لە فیکری ئەوەدا بووم، چۆن لە قوتابخانە هەڵبێم و بچم بۆ قەراغ چۆمەکە، بەلام بە بێ گیلبێرتۆ و تووبیاس. پێم خۆش بوو هەر لەگەڵ ئیبراهامدا بچم، هەر خۆمان لە نێو دالانە سەوزەکان دا. ئەگەر ئەم پیاوەی بۆ دیداری بابەگەورەم هاتوە، زووتر سەرودڵمان بەربدات، لەوانەیە بتوانم بەر لە

کاتژمێر چوار بگەڕێمەوە ماڵێ. ئەو کاتە لەگەڵ ئیبراهام بە یەکەوە دەچین بۆ قەراغ چۆمەکە.

£

£

ئەو پیاوە غەوارەیە هات و لە ماڵی ئێمەدا باروبنەی لێ خست و جێی خۆش کرد.

لە نێو یەکێك لە وەتاغە پەڕەکانی دوور لە هەیوانەکەدا گیرساوە. ئەو وەتاغەی دەڕوانێتە سەر شەقامەکە، لە بەر ئەوەی پێم وابوو ئەو دیوە بۆ ئەو شوێنێکی شیاو و گونجاوە، لێم ڕوون بوو لە نێو هۆتێلە چکۆڵەکەی شاردا، هەڵ ناکات. نووسراوەیەکی نووسی و بە پشت دەرگاکەیەوە نووساند. (هەتا دوو سێ ساڵ لەمەو بەر هەر بە دەرگاکەوە بوو، هەتا ئەو کاتەی دار و دیواری ماڵەکەیان ڕەنگ کرد.) لە پاش دوو هەفتە ناچار بووین بۆ دابینکردنی پێداویستییە لە ڕادەبەدەرەکانی دەستێك مێز و کورسیی تازە بکڕین.

ئەو کاتەی نامەکەی سەرهەنگ ئورلییانۆ بوئێندیای دایە دەستم، دانیشتنەکەمان و قسەکردنەکەمان ئەوەندەی خایاند، ئادێلایدا بە بێ دوودڵی باوەڕی کردبوو ئەم پیاوە ڕاسپاردەیەکی گرینگی لە لای کەسێکی پایەبەرزی سەربازییەوە پێیە، مێزی خواردنەکەی وەها ڕازاندبوەوە، کە قابیل بە شانوشکۆی شا بێ. لە بابەت سەرهەنگ بوئێندیا و کچە عازەبەکەی و کوڕە سەر بزێوەکەیەوە زۆرمان قسە کرد،

هێشتا تەنووری باسەکەمان تەواو گەرم نەببوو، هەستم کرد ئەو پیاوە فەرماندەری گشتی بە باشی دەناسێ و هەر لە بەر ئەوەیشە ئەوەندی ڕێزی بۆ دادەنێ و بەرپرسایەتیی تەواوی کارەکانی دەگرێتە ئەستۆ. کاتێك مێمێ هاتە ژووری پێمان بڵێ، شێو سازە، پێم وا بوو هەر وا بەپەلە شتێکیان لێ نابێ، بەڵام بە دیتنی ئەو مێزە ڕازاوە و ڕەنگینە و ئەو تەشکیلاتە بێوێنە و ئەو قاپ و قاچاخە چینییەی، کە تەنیا تایبەتە بە میوانداریی بنەماڵەکان و هەر لە ڕۆژی جەژنی کریسمەسدا کەڵکیان لێ وەردەگیرا، تەواو دڵخۆش و ڕووسووری کردم.

ئادێلایدا بەڕێزەوە لە سەر کورسییەکە دانیشتبوو، کراسە مەخمەرییە ملیواندارەکەی لە بەر کردبوو، ئەو کراسەی بەر لە زەماوەنکردنمان بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری ماڵێ لە شار لە بەری دەکرد. ئادێلایدا لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی دا مرۆڤێکی هەستیار و وردبین بوو، میداڵی گەورەی بنەماڵەی لە سەر سنگی دابوو، جاروبارە لە سەرسنگیدا بریقەی دەهات. هەموو شتەکان، وەك مێزەکە، شتومەکەکان، قاپ و کەوچکەکان، ئەو هەناسەیەی لە ژووری نانخواردنەکەدا هەڵمان دەکێشا، لێوڕێژ بوو لە ئارامی و مەزنی و جوانی. کاتێك چووینە نێو ژووری نانخواردنەکەوە، ئەو پیاوەی لە هەموو هەڵسوکەوت و کار و کردەوەکانی دا بە سەرنج و وردبینییەوە دەیڕوانییە هەموو شتێك و مووی لە ماست دەرکێشا، لەوانەیە تەواو هەستی بە شەرمەزاری کردبێ، ئازا دوگمەی ملیوانی کراسەکەی وەك ئەوەی بۆینباخی بەستبێ، ڕێکوپێك کرد، لە هەنگاوە قورس و قایمەکانی دا هەست بە شڵەژاوی و لەرزۆکی دەکرا،

هـیچ کـات. ئـەو سـاتەوەختەی بـە یەکـەوە پێمـان نایـە نێـو ژووری نانخواردنەکە لە بیر ناکـەم، لـە بـەر ئـەوەی پـێم وا بـوو، ئـەو جلوبەرگـە نارێکە من لە بەرم دابوو لە گەڵ ئەو مێزە ڕێکوپێکـەی ئادێلایـدا، کـە بـە وردبینییەکی تەواو و بێوێنەوە ڕازاندبوویەوە، نەدەگونجا.

دەورییـەکان پـڕ بـوون لـە کـەبابی گۆشـتی نێچـیری ڕاو و گۆشـتی گـا، خواردنـەکان شـتێکی تـازە و نایـاب نـەبوون، هـەر ئـەو خواردنانـە بـوون هەموو ڕۆژێك لە ماڵی ئێمەدا دەخـوران، ئـەوەی گـرینگ و جێـی بایـەخ و سەرنج بوو، ڕازاندنەوەی مێزەکە و دانانی ئەو دەورییە چینیانە بـوو، کـە لە پـەنای ئـەو جێمۆمانـەدا بریقـەبریقیان خسـتبوە ولات و سـەر مێزەکـە لەگـەڵ ڕۆژە ئاسـاییەکانی مـاڵی ئێمـەدا گـۆڕانێکی زۆری بـە خۆیـەوە دیتبوو. خێزانم سەرەڕای ئەوەی دەیزانی هەر میوانێکمان هەیـە، هەشـت دەوریی بـە ڕێکـوپێکی و سـەرنجێکی تـەواوەوە چـنیبوو، لـە ناوەڕاسـتی مێزەکەدا شەربەیەکی (پەرداخێکی گەورە) گەورەی پڕ کردبوو لە شەراب و دای نابوو، زیاتر لە ئەندازە زیادەڕەویی تێدا کردبوو، ئەوەیش هەمووی بۆ پیاوێك بوو کە هەر لە سـەرەتاوە پێمـان وابـوو ئـەو کابرایـە پیـاوێکی خـاوەن دەسـەڵات و پلەیـەکی بـەرزی سـەربازییە. پێشـتر هـیچ کاتێـك ماڵەکـەمانم بـەو داب دەسـتووورە ئەفسـانەییە نـەدیبوو. ئەگـەر دەسـتە جوانەکانی نەبوایە، جلوبەرگەکەی زۆر ناحەز و گەمژانە دەهاتە بەر چـاو. دەسـتە جوانـەکانی ئادێلایـدا سـەرەڕای جـوانی و ناسـکییان، لەگـەڵ ئارایيشی ڕووخساریشیدا یەکیان دەگرتەوە، کاتێـك پیاوەکـە دوگمـەکانی

یەخەی ڕێکوپێك کردەوە، هەلەکەم بە لە بار زانی و گوتم: «دوکتۆر ئەوە ژنی دووهەمم، ئادێلایدا.

ئادێلایدا ڕەنگی تەواو تێك چوو، تۆزی تەمێکی قورس ڕووخساری داپۆشی، لە جێگای خۆی وشك بوو، بە بزەیەکەوە دەستی بۆ درێژ کرد، بەڵام ئیتر ئەو هەستە وشك و فەرمییەی کاتی چوونە ژوورەوەمان بۆ دیوی نانخواردنەکەی تێدا بە دی نەدەکرا، ئەم میوانە تازەیە وەك سەربارێك پاژنەکانی توند بە یەکدا کێشا و دەستەکانی بە شێوەی ئیکلامکێشان هەتا لای سەری برد و پاشان لە ئادێلایدا چوە پێشی و گوتی: «بەڵێ خاتوون...» بەڵام ناوی نەهێنا.

لە بەر چاوم بە توندی و بە هەڵپە دەستی ئادێلایدای ڕێك دەگوشی، تێگەییشتم ئەو پیاوە مرۆڤێکی چەندە ڕەشۆکی و ئاساییە، لە لای مێزەکەوە، لە بەرانبەر قاپ و کەوچکە بلوورە تازەکاندا لە ئاستی مۆمدانەکاندا دانیشت، شلەژاوییەکەی وەك تکەی ڕژاوی سوبێك لە چاوی دەدا.

ئادێلایدا شەرابی تێ کرد، دڵەکوتێ سەرەتاییەکەی وردەوردە تێکەڵ بە ترس دەبوو، هەر دەتگوت دەیەوێ بڵێ: «زۆر باشە، هەموو شتێك وەك بڕیار درا بوو، بە ڕێوە دەچێ، بەڵام من و تۆ بمانمێنێت، گنگر و ماست بۆ وەختی خۆی.

پاش ئەوەی ئادێلایدا شەرابی تێ کرد و لە سەر جێی خۆی دانیشت، مێمێ دەستی کرد بە تێکردنی چێشتەکە، پیاوەکە پاڵی دا بە پشتی کورسییەکەیەوە، دەستەکانی نایە سەر مێزەکە و بە بزەیەکەوە گوتی:

«بێزەحمەت خاتوون، تکایە هەندێك گیام بۆ بکوڵێنـە و وەك سـووب بـۆم لێنێ و بۆم بێنە.

مێمێ لە جێی خۆی وشك بوو، لەوانە بوو لە قاقای پێکەنین بـدات، بـەڵام شوێنەکە بۆ پێکەنین نەدەبوو، مێمێ بە جێی ئەو ڕووی کردە ئادێلایـدا و بە بزە و سەر سووڕمانەوە لێی پرسی: «چ جۆرە گیایەك دوکتۆر؟!»

بە شێوەی بیرمەندێك و بە منگەمنگەوە گوتی: «هـەر گیایـەکی ئاسـایی، خاتوون... هەر لەو گیایانەی دەیکەنە بەر ئەسپەکان!



جاری وا هەیە زەمان لە جوولە دەکەوێ و کات خـەوێکی قـورس دای دەگـــرێ، تەنانـــەت جوولـــە و ســـووڕانی پـــڕ لـــە ڕەمـــز و ڕازی مێشـوولەکانیش لـەو کاتـە هەسـتیارەدا دەیبەسـتێ. گـەڕانی ئاسـاییی سروشت لە جوولە دەکەوێ و گەردوون تووشی ئاریشە و خلیسکان دەبێ و ژنـەکان، بـە کەشـتەنگی لـە خـەو ڕادەچـەنن، سـەرکولمەیان وێنـەی گولدۆزی سەر ڕووی سەرینەکەیانی پێوەیە و لە ژێـر گوشـار و تـینی بـەر گـەرمای تاقەتپڕووکێنـدا، کـە وەك پەنجەیـەکی پـۆلایی گـەروویان ڕێـك دەگوشێ، تووشی سەرلێشـێوان دەبـن و پێیـان وایـە ئێسـتا لـە ماکانـدۆ چوارشەممەیە، پاشان هەلدەستن و دەگەڕێنەوە، هەتا لـە قوژبنێکـدا کـۆ ببنـەوە و خەونەکـەیان لەگـەل ڕاسـتییەکاندا بـە یەکـەوە گـرێ بـدەن، باسەکەیان گەرا هەلدێنێ و بە ئاکام دەگات، لەگەل یەکدا دەست دەکـەن بە دەنگۆسازکردن، هەر وەك ئەوەی تێکـڕای ژنـانی شـار لـە هـەرەوەزی چنینی مافووریەکی ڕەنگاوڕەنگدا بەشدارییان کردبێ.

ئەگەر کات لە هەناوی مرۆڤدا هەر ئەو جووڵەیەی دەبوو کە لە دەرەوە لە بزووت دایە، ئێستا ئێمە دەبوایە بە تابووتەکەوە، لە ناوەڕاستی شەقامدا، لە ژێر تیشکی هەتاودا بووینایە. لە دەرەوە کات لە ڕەوت و جووڵەدا بوو، لە دەرەوە درەنگ بوو، کات بزوابوو، شەو داهاتبوو، شەوێکی شێداری مانگی سێپتامبەر بوو، ئەوان لەگەڵ مانگ و ژنەکانیان دا لە نێو ماڵەکانیان دا و لە ژێر تریفەی سەوزی مانگدا دانیشتبوون و قسەیان دەکرد، ئێمەی دەربەدەریش بە نێو شەقامەکاندا، بە تینوێتی لە ژێر تیشکی گەرمی تاوی سێپتامبەردا بووین، هیچ کەسێك لە ڕێوڕەسمەکەمان دا بەشداریی نەدەکرد، چاوەڕوان بووین سەرۆکی شارەوانی لە بڕیارەکەی بۆ بەخاکسپاردنی تەرمەکە پاشگەز ببێتەوە و ئێمە بگەڕێینەوە بۆ ماڵی خۆمان.

منداڵەکەم بچێتەوە بۆ قوتابخانە و بابیشم بەرەو کەوشە دارییەکانی خۆی بچێت و دڵۆپ دڵۆپ ئاوی فێنك لە سەر سەرییەوە بتکێتە نێو دەستشۆرییەکە و پەرداخێکی گەورەی پڕ لە شەربەتی ئاو لیمۆی فێنك لە لای چەپییەوە دانرابێ، بەڵام ئێستا هەلومەرجەکە گۆڕاوە، بابم یەکەم جارێك خەریکە بڕیارەکەی خۆی بە زۆری بە سەر کەسێکدا بسەپێنێ، لە سەرەتاوە هەستم کرد بڕیارەکەی سەرۆك شارەوانییە، کە لە دەرەوەی شار ئاژاوەیەکی چڕ سەری هەڵ داوە، دەنگۆیەکی درێژخایەن و بەردەوام و بێڕەحمانە، هەموو شوێنێکی ئاخنیوە، شەقامەکانی پاك و خاوێنن، بێ ئەوەی سێبەرێك کەوتبێتە سەر خاك و خۆڵە خاوێنەکەی، شار زیرۆحێکی تێدا نییە و دەرگای هەموو ماڵەکانی گاڵە دراوە، لە نێو ماڵەکانیشیەوە

بێجگە لەو دەنگانەی پیت و وشەکانیان پڕ بوون لە لۆمە و خراپە گوتن و بێ ڕێزی پێ کردن، هیچ دەنگێکی تریان لێوە نەدەهاتە دەرێ.
منداڵەکە لە نێو دیوەکەدا ڕەپ دانیشتوە و چاوی بڕیوەتە کەوشـەکانی و لەوێوە سەرنجی دەگوێزێتەوە بۆ سـەر چـراکە، پاشـان بـۆ ڕۆژنامـەکان و دوایی بە پەلـە بـەرەو تـەرمی پیـاوە مردوەکـە، زمـانی بـە لالـەغاوەی دا هاتۆتە دەرێ... چاوە زەردەکانی کە هەر لە چاوی ئاژەڵ دەچن و ئێستا ئـیتر بـە هەوەسـەوە نـاڕوانن، وەك سـەگێکی تێـر و بـێ ئیشـتیبا بـۆی کەوتوە، منداڵەکە چاوی لێ دەکات، بیر لـە پیـاوە مردوەکـە دەکاتـەوە، ئێستا لە ژێر ئەو تەختانەدا ڕاکشاوە، لـە ناکـاو هـەموو شـتێك دەگـۆڕێ، کورسـییەك لـە دەرگـای ئاراییشـگاکەوە دێتـە دەرێ و بـە ئاوێنەیـەك و قالبێـك سـابوون و ئـاوی گـەرم و عـەترەوە خـۆ دەکـات بـە نێـو دیـوە چکۆلەکەدا و دەستە گەورەکانی پڕ دەبن لـە پنـۆك، ئـەوە ئـیتر دەسـتی کوڕەکەی من نییە، بۆتە دەستێکی گەورە و چالاك و بە توانا، بێ ئەوەی خۆی بۆ ماندوو بکات.
بـە سـەرنجێکی تـەواوەوە تیغەکـەی بـەتاڵێکی چـەرم تیـژ دەکـات و لـەو کاتەدا گوێچـکە، خشەخشـی تیغـی تیـژ دەبیسـتێ و سـەریش، بـیر لـەوە دەکاتـەوە: ئـەو ڕۆکـە زووتـر دێـن، لـە بـەر ئـەوەی ئـەمڕۆ لـە ماکانـدۆ چوارشـەممەیە... بەرەبـەرە دێـن... لـە سـەر کورسـییەکاندا و لـە ژێـر سێبەری بەر دەرگاکەدا دادەنیشن، بە ڕوویەکی تاڵەوە و بە دزییەوە چاو لـێ دەکـەن. لاقیـان دەنێنـە سـەر لاقـەکانیان و دەسـتەکانیان لـە سـەر ئەژنۆیانـەوە لـە یـەکتری هەڵـدەپێکن، قوونچـکی سـیغارەکانیان بـە

ددانەکانیان دەگەزن، چاو لێ دەکەن و بێدەنگ باسی هیچ شتێك ناکەن، لە پەنجەرە داخراوەکەی بەرانبەریان و، لە ماڵە کپ و بێدەنگەکەی ڕێبێکا خاتوون دەڕوانن، ئێستایش هەر لەوێدا دەژی و ئەویش لە بیری چوە باوەشێنە کارەباییەکەی بکوژێنێتەوە و باکەی پەردەکانی لە پەنجەرەکەیەوە ئاودیوی دەرێ دەکات، ئەویش تووڕەیە، شڵەژاوە، بە نێو کەلوپەلی سەردەمی تاڵی بێوەژنیدا تێ دەپەڕێ.

دەرگای وەتاغەکانی دەکاتەوە و زوو دایان دەخاتەوە، چاوەڕوانە هەتا کاتژمێرە دیوارەییەکەی سەردەمی پیاوسالاری لە خەوی حەوتشەو و حەوتڕۆژە هەستی و بە سێ کەڕەت لێدان خەڵاتی یادەوەریی ئەو بداتەوە، لە تەواوی ئەو ماوەیەدا، لەو کاتەدا کە منداڵەکە قسەکانی تەواو دەکات و پیاوانە لە سەر جێگاکەی خۆی دادەنیشێتەوە، هەر ئەوەندە دەخایەنێ، ژنێك پێویستی پێیەتی هەتا بە مەکینەیەکی دروومان، ئاخرین تەقەڵ لە پارچەیەك بدات و سەرە بە بیگووودی سواغدراوەکەی هەڵدێنێ، هەتا منداڵەکە لە سەر جێی خۆی بە ڕێکوپێکی دابنیشێت و بڕواتە ماڵی فیکرەوە. ژنە مەکینەی درووماننەکەی خۆی هێناوەتە قوژبنێکی بەر هەیوانەکە، ئاگۆندای کەمئەندام هەر هەوڵ دەدات هەتا ئەژنۆ وشك و نووستوەکانی لە خەو هەستێنێ و ڕێبێکا خاتوونیش لە هەوڵی ئەوە دایە کلیلەکەی بخاتە نێو قوفڵەکەوە و لە بەر خۆیەوە دەڵێ: «چوارشەممانە لە ماکاندۆ ڕۆژێکی شیاوە بۆ ناشتنی ئیبلیس.» بەڵام هەمیسان منداڵەکە دەجووڵێتەوە و کات گۆڕانی بە سەردا دێ، هەتا ئەو کاتەی شتەکان دەجووڵێنەوە، زەمان لە جێی خۆی قەتیس نامێنێ و لە

جووڵە ناکەوێت، بەڵام بۆ پیاوە مردوەکە کات لە سەر جێیی خۆی دەمەیێ و ناجووڵێ، لە بەر ئەوەی تەنانەت ئەگەر دەستی منداڵەکەیش بجووڵێتەوە، ئەو هەستی پێ ناکات و ئاگای لێ نابێ و ئاگایشی لێ نییە.
(لەبەر ئەوەی منداڵەکە بەردەوام دەستی دەجووڵێنێتەوە) لەوانەیە ئاگۆندا دەنگێك لە مووڕووی تەزبێحەکەی سووڕاندبێ، ڕێبێکا خاتوونیش پاڵی داوە بە پشتی کورسییەکەی خۆیەوە، مات و کاسە، چاو لە کاتژمێرەکە دەکات، لە سەر لێواری بەر لە ڕووداوەکە خەوی لێ کەوتوە و ئاگۆندا هەلی بۆ دەرەخسێ (تەنانەت ئەگەر کاتژمێرەکەی ڕێبێکا خاتوون لە جێی خۆی چرکەیەکیشی نەکردبێ) هەتا دەنکێکی تری لە تەزبێحەی بگێڕێ و بیر لەوە بکاتەوە: «ئەگەر تووشی باوە ئانخێل بووم ئاوا دەکەم.
پاشان دەستی منداڵەکە دێتە خوارێ و دەمە تیغەکە بە سەر چەرمە هەسانییەکەدا دەخشێ و یەکێك لەو پیاوانەی لە ژێر سێبەری دەرگاکەدا ڕاوەستاوە دەڵێ: «دەبێ کاتژمێر سێ و سیخولەك بێ، چاکی بۆ چووم؟
ئاگۆندا هێشتا چاوی لە دەستییەتی، هەتا لاقەکانی ڕا بکێشێ و بە گاگۆلکێ و بە پەلەپەل بچێتە کلێسا و بلێت: «بابە، بابە...»
باوە ئانجێلیش، بە داماوی و دەستەوەستانییەوە لە منداڵەکەی ڕا بمێنێت، لە کاتێکدا زمانی بە لێوە وشکەکانی دا دەسووێ، بە دیتنی ئاگۆندا دەڵێ: «بێ گومان ئەوە موعجزەیە!

پاشانیش هەر وەك ئەوەی هەموو گیانی لە ئارەقەدا خووسابێ و ئاو بە لالەغاوەی دا شۆڕاوگەی بەستبێ، لە نێو جێوبانەکەی دا دەجوولێتەوە، بەڵام جووڵە جووڵەکە بێ سوودە، بابم دێتە ژوورەوە و دوو کات دەکەونە سەر یەك و تێکەڵ یەکتری دەبن، کاتژمێرە دیوارییەکە هەست دەکات لە نێوان پەرێشانی منداڵەکە و بێئۆقرەیی بێوەژنەکەدا گیری خواردوە، ئەو کاتە، گێژ و حۆلە و باوێشك دەدات، لە نێو بێدەنگییە مەزنەکەی ئەو ساتەوەختەدا دەکەوێتە سەماکردن و دڵۆپ دڵۆپ لەگەڵ شلەمەنیی زەماندا دادەچۆڕێ و تێکەڵ بە ڕاستییەکانی سەردەم دەبێ و دێتە دەرێ و سەری دێنێتە پێشێ و بە لە سەرەخۆییەوە دەڵێ: «کاتژمێر ڕاست دوو و چلوحەوت خوولەکە.

بابیشم بێ ئەوەی زانیبێتی ئەو ئیفلیجە چرکەساتەکەی تێك شکاندوە، لە وەڵامی دا دەڵێ: «کچەکەم، تۆ لە نێوان هەورەکاندا ون ببووی.»

منیش دەڵێم: «پێت وایە شتێك ڕوو بدات.

ئەویش بە دەم پێکەنین و ئارەقڕشتنەوە دەڵێ: «لانی کەم لەوە دڵنیام لە تەواوی ئەو ماڵانەدا، برنجەکانیان دەسووتێ و شیرەکانیان لێ هەڵدەچێ.

£

£

دەرگای تابووتەکە داخراوە، کەچی من ڕووخساری مردوەکەم هەر لە بەر چاوە، ئەوەندە بە ڕوونی دەیبینم، ئەگەر پشتیشی تێ بکەم

و ڕوو بکەمە دیوارەکەیش، چاوە زەقەکانی بە ڕوونی دەبینم، ڕوومەتە داچۆڕاوە خۆڵەمێشییەکانی، کە هەر لە خۆڵی شێدار دەچن، زمانە دەرکێشاوەکەی، کە بە بەین ددان و لاشەویلکەی دا هاتبوە دەرێ، ئەوانە هەموو گیانمیان تووشی دڵەکوتێ و شڵەژان کردوە، لەوانەیە ئەگەر دەرەلینگێکی شەڵوارەکەم ئەوەندە تەنگ نەبوایە، ئەو هەستەم نەبوایە.

بابەگەورەم لە پەنای دایکمەوە دانیشتوە، بێدەنگە، هیچ نالێ، چەنەی ناوەتە سەر قەفی گۆچانەکەی و لاقە شەلەکەی ڕاکێشاوە، بابەگەورەم چاوەڕوانە، دایکیشم وەك ئەو چاوەڕوانە، پیاوەکانی تر لە سەر تەختەکە بێدەنگ دانیشتبوون و جگەرە دەکێشن، هەموویان چاویان بڕیوەتە تابووتەکە، ئەوانیش چاوەڕوانن، ئەگەر چاوم ببەستن و دەستم بگرن و چەند کەڕەت بە دەوری شاردا بمگێڕن و پاشان بمهێننەوە نێو ئەم وەتاغە، هەر بە بۆنەکەی دا دەیناسمەوە، ئەو بۆنە زبڵەی لەم وەتاغە دێ، هیچ کاتێك لە بیرم ناچێتەوە، بۆنی زبڵی لە سەر یەك کەڵەکەکراو دەدات، تەواوی وەتاغەکان بە بۆنەکانیاندا دەناسمەوە.

پارە کە ئادێ لە سەر کۆشی دای نام، چاوەکانیان بەستبووم و ئەوم بە نێوان برژۆڵەکانم دا دەدیت... بەلێلی دەمدیت، هەر دەتگوت ژن نییە، بەڵکوو هەر ڕووخسارێکە و چاو لە من دەکات و دەجووڵێتەوە و هەر وەك مەڕ دەبارێنێ، کاتێك هەستم بەو بۆنە کرد، خەو دەیبردمەوە، هیچ بۆنێك لە نێو ئەو ماڵەدا نییە نەی ناسمەوە، کاتێك لە بەر هیوانەکە بەرم دەن. چاوەکانم دەقووچێنم، دەستەکانم درێژ دەکەم و ڕێ دەکەوم، خۆم دەدەمە دەست مێشکم، بیر دەکەمەوە، کاتێك بۆنی ئارەقی کافوور

تێکراو بەر لووتم بکەوێت، ئەوە گەیشتوومەتە بەر دەرگای وەتاغەکەی بابەگەورەم. دیسان درێژە بە ڕێگاکەم دەدەم و لە بەر خۆمەوە دەڵێم: ئەوە ژوورەکەی دایکیشم بە جێ هێشت، هەست بە بۆنی کارتی یاریی نوێ دەکەم، پاشان بۆنی قیل و نەفتالی دێ، درێژە بە ڕێگاکەم دەدەم و بە خۆم دەڵێم: لەمە بەو لاوە بۆنی نەفتالین ناپسێتەوە، پاشان بە لای چەپدا بای دەدەمەوە و ژێرکراسەکان و پەنجەرە داخراوەکان بۆنێکی تریان لێوە دێ، لێرەدا ڕادەوەستم، پاشان سێ هەنگاو بەرەو پێشەوە هەڵدێنمەوە، بۆنێکی تازە هەست پێ دەکەم و دیسان ڕا دەوەستم، بە چاوی قووچاو و دەستە درێژکراوەکانمەوە، گوێم لە دەنگی ئادێ دەبێ کە هاوار دەکات: «ڕۆڵە بۆ بە چاوی قووچاوەوە بە ڕێدا دەڕۆی! ؟

ئەو شەوە لە کاتی نووستن دا، هەستم بە بۆنێك کرد، کە هیچ دیوێکمان ئەو بۆنەی لێ نەدەهات، بۆنێکی خەست و گەرم، دەتگوت چەپکێك گوڵ ڕادەوەشێنن، چاوەکانم لە سەر یەك دانا و بۆنە گەرم و خەستەکەم هەڵمژی و گوتم: «تۆیش هەستی پێ دەکەی؟

ئادێ چاوی لێ کردم و هیچ وەڵامێکی نەدامەوە و چاوەکانی لە سەر یەك دانا و ڕووی وەرگێڕا، دیسان پرسیمەوە: «هەستی پێ دەکەی؟ هەر دەڵێی لە شوێنێکەوە بۆنی عەتری یاسەمەن دێت.

ئەو کاتە وەڵامی دامەوە و گوتی: «بۆنی ئەو یاسەمەنانەیە کە نۆ ساڵ لەمەو بەر لێرە لە سەر ئەو دیوارە شین ببوون.

لە سەر کۆشی دانیشتم و گوتم: «بەڵام کوا، خۆ ئێرە هیچ گوڵێکی یاسەمەنی لێ نییە.

ئەو لە وەڵامم دا گوتی: «ئێستا لێی نییە، بەڵام نۆ ساڵ لەمەو بەر کە تۆ لە دایك بووی، پنجێك یاسەمەن لە حەوشەکەدا ڕوابوو. شەوانە کە هەوا گەرم دەبوو، وەك ئێستا بۆنەکەی وڵاتی دادەگرت.
سەرم خستە سەر شانی، کاتێك قسەی دەکرد، چاوم لە زاری دەبڕی، پێم گوت: «بەڵام ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی من هێشتا لە دایك نەبووم.
-«ئەو سەردەمە تۆفانێکی زستانی هەستا و ناچار بوون باغەکە خاوێن بکەنەوە.
بۆنەکە لەوێوە دەهات، گەرم و ناسراو، ناسیاو و نزیکتر لە هەموو بۆنەکانی تر، بە ئادێم گوت: «پێم خۆشە بۆم بگێڕیتەوە ئەمە چۆن بوە.» چەند ساتێك بێدەنگ بوو، پاشان چەند ساتێك لە دیوارە سپیکاری کراوەکە ڕاما، کە تریفەی مانگەشەوەکە ڕووناکی کردبوو، گوتی: «کاتێك گەورەتر بووی، بۆ خۆت دەزانی گوڵە یاسەمەنەکە چۆن خۆی دەردەخات.
لە مانای وتەکەی نەگەییشتم، بەڵام هەستم کرد هەموو گیانم دەلەرزێ.، هەر وەك ئەوەی کەسێك دەستی بە گیانم دا هێنابێ. گوتم: «هەر وەك ئەو مرۆڤانەی لە پاش مردنیان شەوانە دێنەوە و خۆیانمان پێ نیشان دەدەن!؟
لە سەر کۆشی دانیشتم و سەرم لە سەر شانی دانا، بێدەنگ دانیشتم، بیرم لە شتگەلێکی تر دەکردەوە، لە کورسییەکەی نێو چێشتخانەکەمان کە لە ڕۆژانی باراندا بابەگەورەم پێڵاوەکانی لە سەر دادەنێ هەتا وشك

بنەوە، هەر لەو کاتەوە هەستم کرد پیاوێکی مردوو شەوانە لە نێو چێشتخانەکەمان دا دادەنیشێت، بێ ئەوەی کڵاوەکەی لە سەری داگرێ، چاوی لە خۆڵەمێشە ساردەکانی نێو وەچاخەکە دەبڕێ، پاش چەند ساتێك گوتم: «هەر وەك ئەو پیاوە مردوەی شەوانە لە نێو چێشتخانەکەدا دادەنیشێت.

ئادێ چاوێکی لێ کردم و بە سەر سووڕمانەوە گوتی: «کام پیاوە مردوو؟

–«ئەو پیاوەیە هەموو شەوێك دێت و لە سەر کورسییەکە دادەنیشێت، ئەو کورسییەی بابەگەورەم پێڵاوەکانی خۆی لە سەر دادەنێ هەتا وشك ببنەوە.

–«ئەوێ هیچ مردوویەکی لێ نییە، ئەو کورسییەیان بۆیە لە لای ئەو وەجاغە داناوە خراپ بوە و بە کەڵکی هیچ شتێك نایەت، هەر لە بەر ئەوەیە و هیچی تر.

ئەمانە قسەی ساڵێك لەمەو بەرن، بەڵام ئەمڕۆ هەموو شتێك گۆڕراوە و هیچ شتێك وەك خۆی نەماوە. ئێستا من مردووم دیوە و هەر ئەوەندە پێویستە چاوەکانم لە سەر یەك دابنێم، هەتا بە ڕوونی لە نێو تاریکاییی چاوەکانم دا بیبینم، ویستم بۆ دایکمی بگێڕمەوە، بەڵام ئەو ڕووی کردە بابە گەورەم و گوتی: «پێت وایە شتێکی ئەوتۆ ڕوو بدات؟

بابەگەورەم چەناگەی لە سەر قەفی گۆچانەکەی لا برد و بە سەری ئاماژەیەکی کرد و گوتی: «لانی کەم لەوە دڵنیام تەواوی ئەو ماڵانە، بزنجەکانیان دەسووتێ و شیرەکەیان لێ هەڵدەچێ.



ئەو ڕۆژانەی تازە هاتبوو بۆ ئێرە، بەیانییان هەتا کاتژمێر حەوت بۆی دەنووست، زۆر بە شڵەژاوی و نارێکوپێکی و بە کراسێکی یەخە داچەقاوی دوگمەدارەوە خۆی دەکرد بە نێو چێشتخانەکەدا و قۆڵی کراسە چرچولۆچە چڵکنەکەی هەتا ئانیشك هەڵ دەکرد و شەڵوارێکی چڵکنی هەتا سەر ناوکی هەڵدەکێشا و بە قایشێکی تاریك لە سەر دوگمەکانییەوە بە نێو قەدییەوە جەڕ دەدا، ها ئێستا و ها تاوێکی تر لینگەوقووچ بکەوێت بە ئەرزدا، نێو قەدی ئەوەندە باریك بوو، شەڵوارەکەی پێوە گیر نەدەبوو، بە ڕواڵەت هیچ گۆڕانێکی تێدا ڕووی نەدابوو، تەنیا ئەو گۆڕانەی بە دی دەکرا ئەوە بوو، کە شکۆ و هەیبەتی جلوبەرگە سەربازییەکەی بزر ببوو، ئێستا هەر لە پیاوێکی شڵەژاو و خەواڵوو دەچوو، کە نەی دەزانی ها ئێستا ها تاوێکی تر، چی بە سەر دێ، داهاتووی نادیار و بزر بوو، هیچ هەوڵێکیشی نەدەدا هەتا بزانێ چی ڕوو دەدا و چی ڕوو نادا، کەمێك پاش کاتژمێری حەوت، قاوەکەی هەر بە بێ شیر دەنا بە سەرییەوە و پاشان دەگەڕاوە بۆ نێو وەتاغەکەی خۆی و

لە ژێر لچێکەوە و بە دەم ڕۆیشتنەوە «بەیانی باشێکی» ساردی دەگوت و بە جێی دەهێشتن.

نزیکەی چوار ساڵ لەوەو پێش هات بۆ ئێرە، خەڵکی شار بە پیاوێکی کارامە و ئازایان دەزانی، سەرەڕای ئەوەی پیاوێکی زۆر شپڕێو و نەحەواوە بوو، خەڵکی زۆریان ڕێز لێ دەگرت، ڕێزەکەیش بە هۆی ئازیزی و خۆشەویستییەوە نەبوو، بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو، لێی دەترسان.

ماکاندۆ هەر ئەو دوکتۆرەی لێ بوو، کاتێك کۆمپانیای مۆز کەوتە کار و ڕێگای ئاسن دەستبەکار بوو، لەو کاتەوە ئیتر وردەوردە نەخۆشەکانی لە کەمیان دا و سەر کورسی و نێو وەتاغە چکۆلەکەی چۆڵ بوو، کەس نەدەهات بۆ لای، کاتێك کۆمپانیای مۆز دەرمانگایەکی بۆ کرێکارەکانی خۆی ساز کرد، ژمارەی ئەو کەسانەی لە ماوەی یەکەم ساڵی هاتنی دا، بۆ چارەسەرکردن دەچوونە لای، وردەوردە لە کەمیان دا، بێ گومان ئەو باش دەیزانی تۆفانی گەلا بەرەو چ ئاقارێك دەڕوا و داهاتووی ئەو کارەی بە جوانی لێ ڕوون بوو، هەر لە بەر ئەو هۆیەیش، تەنانەت بە بێ ئەوەی چاو لە نەخۆشێکیش بکات، دەرگای دیوەکەی داخست و هەلۆرکێکی کڕی و لە نێو وەتاغەکەی دا هەڵی واسی. بە درێژایی ئەو ماوەیە مێمێ بە پێی ڕۆژانی پێشتر، ناشتاییەکەی کە مۆز و پرتەقاڵ بوو، بۆ دەبرد و ئەویش میوەکانی دەخوارد و توێکڵەکانی لە نێو وەتاغەکەدا پەرشوبڵاو دەکردەوە و ڕۆژانی شەممەیش، ژنێك دەهات و دیوەکەی بۆ خاوێن دەکردەوە. هەر کەسێك ڕەفتاری ئەوی بدیبایە، دەیزانی ئەگەر

شەممەیەك ئەو ژنە خزمەتکارە نەیەت و دیوەکەی بۆ خاوێن نەکاتەوە، ئەگەر شەنەئاخنیش بێ لە زبڵوزاڵ، بۆ ئەو هیچ جیاوازیی نییە.

ئیتر دەستی بۆ ڕەشوسپی نەدەبرد، هەموو کاتی خۆی لە ناو هەلۆرکەکەی دا ڕادەبوارد و شانەوشانی دەکرد، لە کەلەبەری دەرگاکەوە، لە نێو تاریکییەکەدا، ڕووخسارە لاواز و بێ گیانەکەی دیار بوو، بە سەروقژێکی ئاڵۆزکاوەوە چاوی بڕیبووە شوێنێك، چاوە زەردهەڵگەڕاوەی زیاتر لە چاوی ئاژەڵ دەچوون، وێنەی پیاوێکی پێ دەبەخشی کە نائومێدی بەربینی پێ گرتوە و خەریکە تامی تاڵی تێکشکان دەچێژێت.

ئەو کاتەی کە تازە هاتبوە ماڵی ئێمە، ئادێلایدا بە ڕواڵەت وای دەنواند، لەوە من مۆڵەتم پێ دابوو لە ماڵی ئێمەدا بمێنێتەوە، لاری نییە و تەنانەت ڕازییشە، بەلاّم لەو ڕۆژەوە دەرگای دیوەکەی لە سەر خۆی داخست و لە کاتی نانخواردندا نەهاتە لای ئێمە و بێدەنگ خۆی مات کرد و لە سەر کورسییەکەی دانیشت، ئیتر خێزانم وەزاڵە هات و لێم دەهەری بوو، ڕووی تێ کردم و بە تووڕەییەوە پێی گوتم: «لایەنگریکردن لەو کابرا سپڵەیە، هەڵەیەکی گەورەیە و گوناحت دەگاتێ، وەك ئەوە وایە نان بدەیت بە ئیبلیس و ڕێزی لێ بگری.

منیش بەردەوام، هەم لە ڕووی دڵسۆزی و هەم لە بەر بێدەرەتانییەکەی بەناچاری لایەنگیریم لێ دەکرد. لە سەر قسەکەی خۆم سوور بووم و گوتم: «ئێمە دەبێ ئاگامان لەم پیاوە بێ. ئەو لەم دونیایەدا هیچ کەسوکارێکی نییە و زۆری پێویستی بە یارمەتیی ئێمە هەیە.»

پـاش ئـەوەی ڕێگـای ئاسـن کەوتـە کـار، دەرگـای بەختـەوەری بـە سـەر ماکاندۆدا کرایەوە، خـەڵکێکی زۆر ڕژابوونـە ئـەوێ و سـینەمایەك و چـەند پارکێکی گەشتوگوزاریشی تێدا ساز کرابوو. لـەو شـارەدا کـار بـۆ هـەموو کەسێك هەبوو. هیچ کەسێك بێکار نەبوو، بێجگە لەو، کە دەرگای لە سـەر خـۆی دادەخسـت و هـەتا ئـەو ڕۆژە لـە ناکـاو و لـە کـاتی نـان و چـایی خواردنی بەیانیدا هاتە دیوی نانخواردنەکە و بە شـێوەی تایبـەتی خـۆی، بە دڵخۆشییەکی لە ڕادەبـەدەرەوە لـە بابـەت داهـاتووی شـارەوە کەوتـە قسەکردن و گوتی: «کاتێك بە تۆفانی گـەلاّ ڕابـێین و خـووی پـێ بگـرین، هەموو شتێك گۆڕانی بە سەردا دێ.

لە پاش چەند مانگێك هەموو ئێوارەیەك بەر لە خۆرئاوابوون دەهاتە سـەر شەقام و هەتا دواساتەکانی ڕۆژ لە بەر دەرگای ئارایشگا دادەنیشت و لە باسە گشتییەکاندا بەشداریی دەکرد.

دوکتۆرەکانی کۆمپانیای مۆز پێیان خۆش نەبوو نانودۆی ببڕن، هەر بۆیـە لە ساڵی ١٩٠٧ دا ئەو کاتەی لە ماکاندۆ نەخۆشـێکت بـۆ دەرمـان دەسـت نەدەکـەوت ئـەوی لـە بـیر مـابێ و خۆیشـی بـە تـەواوی هیـوابڕاو ببـوو، یەکێکیان پێشـنیاری بـە نووسـینگەی سـەرۆکی شـارەوانی کـرد، کـە بـە ئاگـاداری هـەموو پسـپۆڕەکانی شـار بگەیـەنێت، هـەتا بـۆ تـاپۆکردنی شەهادەکانیان سەردانی ئەو شوێنە بکەن. کاتێك لە ڕۆژی چوارشـەممەدا ئەو ئاگادارییەیان بـە هـەموو شـوێنەکانی شـاردا بـلاّو کـردەوە، لەوانەیـە لەوە تێگەییشتبێ و زانیبێتی مەبەست لەو ئاگادارییە ئـەوە و ڕاوی ڕێـوی بووکەوڵە، من لە بابەت هۆکارە باشەکانی ئەو کارەوە بە خەستی لەگەڵی

دوام، بەڵام ئەو زۆر لە سەرەخۆ و بە هێمنی هەر وەك ئەوەی مێشێکی میوان نەبێ، وەڵامی دامەوە و گوتی: «سەرهەنگ من کارم بە سەر ئەو شتانەوە نەداوە، تازە خۆم بەو جۆرە شتانەوە ماندوو ناکەم.

هیچ کاتێك من بۆم ڕوون نەبوەوە بڕوانامەکەی ئەو یاسایی بوو یان نا، پاش سێ هەفتە کاتێك سەرۆك شارەوانی و دەفتەردارەکەی هاتنە ماڵەکەی من، هەتا چاو لە مۆڵەتنامەی کارەکەی بکەی، بە هیچ کولۆجێك ڕازی نەبوو لە دیوەکەی بێتە دەرێ.

ئەو ڕۆژە دوای ئەوەی پێنج ساڵ بوو ئەو پیاوە لە ماڵەکەم دا دەژیا، تازە دەمزانی هەتا ئێستا نەمان زانیوە ناوی چییە.

£

£

دیارە پێویست بەوە ناکات، حەتمەن مرۆڤ تەمەنی گەییشتبێتە حەڤدە ساڵ (لەو کاتەدا من ئەوەندەم تەمەن بوو) هەتا هەست بە گۆڕانەکان بکات. ئەو ڕۆژە مێمێ وەك بووك خۆی ڕازاندبوەوە و هاتە کلێسا و پاشان لە دووکانەکەی دا چاوم پێی کەوت و بە یەکەوە قسەمان کرد، ئەو دەرگا چکۆڵەیەی ڕوو بە شەقامەکە دەکرایەوە داخراوە، ماوەیەکی پێ چوو هەتا زانیم زڕدایکم ئەو دەرگایەی داخستوە و ڕازییش نییە کەس دەست بەرێ بۆ ئەو کەلوپەلەی لە ناو ئەو دیوە دایە. ئەو تەختەی بەر لەوەی دوکتۆر هەلۆرکەکە بکڕێ لە سەری دەنووست، مێزی کارەکەی بوو، کە هەر پووڵەکانی لە سەر هەڵگرتبوو، ئەو پووڵانەی لە

ماوەی ئەو چەند ساڵە کارکردنەدا لە سەر یەکی دانابوو، (بە دڵنیاییەوە پۆلێکی کەمیش نەبوە، لە بەر ئەوەی تا ئەو کاتەی لە ماڵی ئێمەدا بوو، هیچ شتێکی نەدەکڕی و بەشی مێمێی دەکرد هەتا دووکانەکەی پێ بڕازێنێتەوە.) بێجگە لەوانە، لۆدەیەك ڕۆژنامەی کۆن کە بە زمانی ئەو نووسرابوون و سووراحی و دەستشۆرێك و هەندێك شتی بێ بایەخی تر، هەر دەتگوت تەواوی ئەو کەلوپەلانە شتێکیان لەگەڵە، دایەگەورەم ئەوانەی بە شتێکی شووم و شەیتانی دەزانین.

وەك لە بیرم بێ دەرگای ئەو دیوە لە مانگی ئۆکتۆبەر یان نۆڤەمبەر بەسترا، (سێ ساڵ بوو مێمێ و دوکتۆر لە ماڵی ئێمە ڕۆیشتبوون.) لە بەر ئەوەی لە سەرەتای ساڵی دواییدا، لەو دیوەدا دەژیام و جارجارە خەونم بە مارتینەوە دەدیت. پێم خۆش بوو پاش زەماوەندەکەم لە نێو ئەو دیوەدا بژیم، زۆری بە دەوردا دەهاتم و پێشنیارم بە دایەگەورەم دەکرد، ئیتر وەختی ئەوە هاتوە هەتا قوفڵی ئەو دەرگایە بکرێتەوە و قەدەغە و قۆرغ لە سەر خۆشترین و ئارامترین ژووری نێو ماڵەکەمان هەڵ بگیرێت.

ئەو کاتەی هێشتا دەستمان نەکردبوو بە دروونی جلوبەرگی بووکێنیم، هیچ کەسێك لە بابەت دوکتۆر و تەنانەت ئەو دیوەی کە ئێستایش بەشێك بوو لە وجوودی ئەو هیچی بە من نەگوتبوو. ئەو وەتاغەی کە بەشێك بوو لە کەسایەتیی ئەو و نەدەکرا هەتا ئەو کاتەی کەسێك لەو ماڵەدا بمایە و ئەوی لە بیر بمایە هەر وا بە ئاسانی لەوماڵەی جوێ بکەیتەوە.

بە تەما بووم بەر لە کۆتاییی ئەو ساڵەدا زەماوەند بکەم، نازانم هەر ئەو بارودۆخە بوو (ئەو بارودۆخەی بوو بە هەوێن و کەسایەتیم لە سەردەمی

منداڵی و مێرمنداڵیدا به پێی ئەو بیچمی گرت) کە ڕواڵەتێکی کاڵی لە کەسایەتییەکانی ئەو سەر دەمەی پێ نیشانی من دا، یان.. نا. بەلاّم ئەوەی بە لای منەوە ڕوون و ئاشکرایە ئەوەیە، لەو سەروبەندەدا کە خەریکی تەدارەکی زەماوەندەکەی من بوون، هەموو شتێك بە لامەوە ئاڵۆز و شێواو بوو، هێشتا من سەرم لە ڕازی زۆربەی شتەکان دەر نەدەهێنا، بە نێو شەپۆلە ئاڵۆزەکانی خەیاڵم دا دەگەڕێمەوە بۆ ساڵێك لەمەو بەر و مارتینم وەك تارماییيەك دێتە بەر چاو، لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەیش بێ، پێم خۆشە ئێستا لەو وەتاغەدا لە تەنیشتمەوە دانیشتبێ، هەتا خۆم ڕازی بکەم پیاوێکی ڕاستی لە گۆڕێدایە، نەك دەستگیرانێکی خەیاڵکردی نێو خەوەکانم، بەلاّم زاتی نەدەکرد ئەو باسە لەگەڵ زڕدایکم دا بێنمە گۆڕێ.

باشترین و ئاسانترین ڕێگا ئەوە بوو پێی بڵێم: «دەمەوێ ئەو قوفڵە بکەمەوە، مێزەکە لە بەر پەنجەرەکە دابنێم و تەختەکەیش بنێم بە دیوارەکەوە و گوڵدانێکی مێخەکە لە سەر تاقچەکە دابنێم و چڵێکیش عوود لە سەر دەرگای چوونە ژوورەوەکە...» بەلاّم ترس و دڵەکوتێی من لەگەڵ وێنەیەکی تەمومژاویی دەستگیرانەکەم دا ئاوێتە ببوو، من ئەوم وەك شتێکی وەهمی و دوورەدەست دەهاتەوە بیر و تەنیا ڕواڵەتیم دەهاتە بەر زەین و ئەوەی دەمدیت: سمێڵە ڕەشە قەترانییەکەی، سەری کە بە حاڵێك و دوو بەلاّ بە لای چەپەی دا خوار ببوەوە و کۆتوشەلّوارە چوار دوگمەییيەکەی بوو.

لە کۆتاییەکانی مانگی ژوییەدا هاتبوو بۆ ماڵی ئێمە. ئەو ڕۆژە لە ماڵی ئێمە مایەوە و لە بابەت کارێکی نادیارەوە (هیچ کاتێك نەم زانی چ کارێك بوو.) لەگەڵ بابم لە نووسینگەکەی دا قسەیان دەکرد. عەسری ئەو ڕۆژە من و زڕدایکم و مارتین چووینە دەرەوەی شار، بەڵام لە کاتی گەڕانەوەدا، ئەو کاتەی شانبەشانی یەکتری بەرەو شار دەگەڕاینەوە و لە بەر تیشکی زێڕینی هەتاودا لێم دەڕوانی، هەر لە بوونەوەرێکی خەیاڵی دەچوو. هەستم کرد لەو کاتەدا کە دەڵێم «دەمەوێ ژوورەکە بۆ مارتین ڕێکوپێك بکەم...» ئەگەر بڕیار بێ بیرەوەرییەکانی ورەو هێزم پێ ببەخشێت، هیچ کاتێك ناتوانم وەك مرۆڤێکی ڕاستەقینە چاوی لێ بکەم و ئەو خۆڕاگرییەی تێدا ببینم، کە بۆ ژیان پێویستم پێیەتی.
لە ڕاستیدا هەتا ساڵێك بەر لە ڕێوڕەسمی زەماوەندەکەمان هەر بە بای خەیاڵیشم دا نەدەهات لەگەڵ مارتیندا زەماوەند بکەم. ئەوم لە مانگی فێوریەدا لە ڕێوڕەسمی شەوبێداری منداڵەکەی پالۆکۆیمادۆدا دیت، من و چەند کچێکی تر لەوێ بووین و گۆرانیمان دەگوت و چەپڵەمان لێ دەدا و دەمانەویست لەو هەلەی بۆمان ڕەخساوە، باشترین کەڵکی بۆ خۆشی و شادی خۆمانی لێ وەرگرین. ماکاندۆ هۆڵێکی سینەمایی لێ بوو. گرامافۆنێکی گشتی و چەند شوێنێکی تری بۆ سەیرانکردن، بەڵام زڕدایکم و بابم ڕازی نەبوون کچێکی عازەبی وەك من هاتوچۆی ئەو شوێنانە بکات، ئەوان پێیان وابوو. «ئەو شێوە ڕابواردنانە تۆفانی گەڵا لەگەڵ خۆی دا هێناونییەتە ئەم شارەوە.

له مانگی فێورییەدا نێوەڕوان هەوا گەرم دەبوو، لەگەڵ زڕدایکم دا لە سەر بانیژەکە دادەنیشین و قەراغی پارچەیەکی سپیی گەورەمان دادەگرتەوە، بابیشم لە پاش نانخواردن سەر خەوێکی دەشکاند، ئێمە درێژەمان بە دەورگرتنی پارچە گەورەکە دەدا، هەتا بابم لە خەو هەڵدەستا بە تەق و گوت بە لای ئێمەدا (بە پێڵاوە دارینەکانیەوە) تێ دەپەڕی و دەچوو سەری فێنك كاتەوە، بەڵام لە مانگی فێورییەدا شەوەکانی فێنك و خۆش بوون، دەنگی ژنان لە ڕێوڕەسمی شەو بێداریدا لە هەموو کۆڵانەکانی شاردا دەنگی دەدایەوە.

ئەو شەوەی بۆ ڕێوڕەسمی شەوبێداری چووبووینە ماڵی پالۆکۆیمادۆ دەنگی مێمێ ئۆرۆسکۆ لە هەمووومان خۆشتر بوو. ژنێکی تلیاکی و ڕەقوتەق بوو، هەر دەتگوت تەلی خواردوە. لە یەکەمین وچاندا، خێنو واگارسیا گوتی: «لە دەرەوە غەوارەیەك گوێی لێ گرتووین.» پێم وا بێ هەموومان بێ جگە لە ڕمدیوس ئوروسکۆ بێدەنگ بووین. خێنو واگارسیا گوتی: «لە سەرەتای شەوەوە هەتا ئێستا دەنگی دەهات و ئەوانەی تریش بێ ئەوەی دەنگیان لێوە بێ گوێیان لێ ڕاگرتبووین. کۆتێکی چوار دوگمەیی لە بەر دایە و کاتێك لاقەکانی لە سەر یەك دادەنێ مرۆڤ گۆرەوییەکانی و قەیتانی گۆرەوییەکانی و قەیتانی کەوشەکانیشی دەبینێ!

مێمێ و ئورۆسکۆ هەر گۆرانییان دەگوت کە ئێمە دەستمان کرد بە چەپڵەلێدان و گوتمان: «دەبێ ببینە هاوسەری ئەو پیاوە!

کاتێك گەڕاینەوە ماڵێ و بیرم لەو ڕووداوە کردەوە هەر دەتگوت خەونم دیوە، هیچ شتێکم بۆ نەدەچووەوە سەر یەك. ئەو قسانە بە شێوەیەك بە دیواری بیرەوەریمەوە نووساون، هەر دەڵێی کۆمەڵێك ژنی خەیاڵی لە ماڵێکی خەیاڵی دا بە یەکەوە دانیشتوون و منداڵێکی خەیاڵی مردوە و چەپڵەیان لێ داوە و گۆرانییان گوتوە.

ژنەکانی تر لە لای منەوە سیغاریان دەکێشا، وەك سالارە ژن دانیشتبوون و ملە درێژەکانیان کە هەر لە ملی داڵ دەچوو بەرەو لای ئێمە خوار کردبوەوە. ژنێك لە فێنکاییی چەقی دەرگاکەدا بە پەڕۆیەکی پانی ڕەش، سەری پێچابوو دانیشتبوو، چاوەڕێ بوو قاوەکە بێتە کوڵ، لە ناکاو دەنگێکی پیاوانە تێکەڵ بە دەنگی ئێمە بوو، لە سەرەتاوە ناخۆش و بێ ناوەڕۆك بوو، بەلام وردەوردە وەك زەنگوڵە دەنگی دەدایەوە و هەموو لەشی مرۆڤی پڕ دەکرد لە گەرمی و تەزوو و مووچڕکی بە دڵی دا دەهێنا، هەر دەتگوت پیاوێك لە نێو کلێسادا خەریکی گۆرانیگوتنە. واگارسیا سیخورمەیەکی لە لاقەبرغەم کوتا، سەرم هەڵێنا و بۆ یەکەمین جار چاوم بە چاوی کەوت، لاوێکی جوان چاك و بە دەماخ بوو، هەر چوار دوگمەی کۆتەکەی بە ڕێکوپێکی داخستبوو، بە سیلەی چاوی لە منی دەڕوانی.

£

£

له مانگی سێپتامبه‌ردا هه‌واڵی گه‌ڕانه‌وه‌یم پێگه‌ییشت، له به‌ر خۆمه‌وه گوتم، ئه‌و وه‌تاغه قوفڵ کراوه به ڕاستی شیاوی ئه‌وه و خودا بۆ ئه‌وه‌ی داناوه، به‌لام تا ئه‌و کاته هه‌موو لایه‌نه‌کانیم به جوانی هه‌ڵ نه‌سه‌نگاندبوو، له به‌ر خۆمه‌وه گوتم: «مارتین، مارتین، مارتین...
ورده‌ورده مانای ناوه‌که‌ی گۆڕانی به سه‌ردا هات، قورسی و سووکیی پێ کرا و هه‌موو پێکهاته‌کانی له به‌ر یه‌کتری هه‌ڵوه‌شانه‌وه و به ته‌واوی له به‌ر چاوم بوو به شتێکی دزێو و بێ ناوه‌رۆك و قێزه‌ون.
کاتێك له شوێنی شه‌وبێدارییه‌که وه ده‌ر که‌وتین، فنجانێکی به‌تاڵی له به‌ر ده‌م دانام و گوتی: «فاڵی قاوه‌م بۆ گرتوویه‌ته‌وه.
ئه‌و کاته‌ی له‌گه‌ڵ کچه‌کاندا ده‌چووینه ده‌رێ، گوێم له ده‌نگه خۆشه‌که‌ی بوو که ده‌یگوت: «هه‌ر کاتێك حه‌وت ئه‌ستێره ببژێریت، خه‌ون به منه‌وه ده‌بینی.
ئه‌و کاته‌ی له ده‌رگاکه هاتینه ده‌رێ، منداڵه‌که‌ی پالۆکۆیمادۆ له نێو تابووته‌که‌دا دیت، ئاردێکی سپییان له سه‌روچاوی هه‌ڵساوی بوو، گوڵێکیان نابوه نێو ده‌می و چیلکه‌یه‌کیان دابوه به‌ر پێڵوه‌کانی، هه‌تا چاوه‌کانی به ئاواڵه‌یی بمێننه‌وه و نه‌قووچێن. مانگی فێورییه مانگی مردن و ناشتن بوو، بۆنی عه‌تر و وه‌نه‌وشه و یاسه‌مه‌ن له به‌ر گه‌رما به نێو وه‌تاغه‌کاندا بلاو ده‌بووه‌وه، به‌لام له نێو ئه‌و بێده‌نگییه‌دا، به‌رده‌وام ده‌نگێکی تایبه‌ت ده‌بیسترا. «له بیرت نه‌چێته‌وه، ته‌نیا هه‌ر حه‌وت ئه‌ستێره.

کاتێك هات بۆ ماڵی ئێمە پێمان نابوە نێو مانگی ژووئییەوە، پێی خۆش بوو لە تەنیشت ئەو گوڵدانانەوە دانیشێت، کە لـە تەنیشـت لاجامەکانـەوە دانرابوون. گوتی: «پێویستە ئەو ڕازەت لە لا بدرکێنم و تۆیش بزانی هەتا ئێستا نەم توانیوە تێرتێر لەو چاوانەت ڕا بمێنم. ئەوە بزانە ئـەوەی پێـت دەڵـێم ڕازی دەروونــی پیاوێکــە، وردەوردە خـەریکـە ترسـی عاشـقبوون هەموو گیانی دادەگرێ.

ڕاستی دەکرد، نەم دەزانـی چـاوەکانی چـۆنن، لـە مـانگی ژووئییـەدا مـن هێشتا نەم دەزانی چاوی ئەو پیاوەی کـە بڕیـارە لـە مـانگی دێسـامبەردا زەماوەنـدی لەگـەڵ بکـەم چ ڕەنگێکـە. شـەش مـانگ لـەوە پـێش، پـاش نیوەڕۆی ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی مانگی فێوریيە بوو، ئەو ڕۆژە هەموو شتێکم بۆ ڕوون بوەوە. جووتێك کرمی نێرومێم دیت لە بنی حەمامەکەدا لـە یـەك ئالاّ بوون و ژنێکی دەرۆزەکەریش لە ڕۆژی سێشـەممەدا، داوای چـڵێك دار لیمۆی لێ کـردم، ئـەویش بـە ئەرخـەیانی پـاڵی لـێ دابـوەوە دوگمـەکانی کۆتەکەی ڕێکوپێك بـوون، شـیلەبزەیەك گرتـی و گـوتی: «کارێـك دەکـەم هەموو ساتەکانی شەو و ڕۆژی ژیانت هەر بیر لە من بکەیتـەوە، وێنەکـەت بــە پشــتی دەرگاکــەوە هەڵدەواســم و دوو دەرزیــش هەڵدەچــەقێنمە نێوگلێنــەی چــاوەکانتەوە.» ئــەو کاتــە جێنۆڤێڤــا گارســیا بــە دەم پێکەنینــەوە گــوتی: «پیــاوان ئــەو قســەقۆڕ و بێئامانانایانــە لــە ژنــانی گواجیراییيەوە فێر بوون!

لـە کۆتاییيـەکانی مـانگی مارسـدا، مـارتین ببـوە یـەکێك لـە ئەنـدامانی بنەماڵەی ئێمە، زۆربەی کاتەکانی لە لای بابم ڕادەبوارد و هـەوڵی دەدا لـە

بابەت شتێکەوە ڕازی کات. من هەرگیز نەم زانی ئەوە چی بوو، ئێستا ئەوە چواردە ساڵ بە سەر زەماوەندەکەی ئێمەدا تێ دەپەڕێ و نۆ ساڵیش لەو ساتە ڕادەبرێ، کە لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەوە خوداحافیزیی لێ کردم و بەڵێنی لێ وەرگرتم بە جوانی ئاگاداری منداڵەکە بم.

لە ماوەی ئەو نۆ ساڵەدا هیچ هەواڵێکمان لێ نەزانیوە و بابیشم کە لە چوون بۆ ئەو سەفەرە بێ گەڕانەوە یارمەتی دا، تا ئێستا هەرگیز لە بابەت گەڕانەوەیەوە قسەیەکی نەکردوە، تەنانەت لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی لەگەڵ یەکتری دا دەژیاین، نەم توانی جوانتر و ڕوونتر لەو شەو بێدارییە ببینم، کە لە ماڵی پالوکۆیمادۆ دیتبووم، یان ئەو شەوی یەکشەممەی لە مانگی مارسدا بۆ کەڕەتی دووهەم لە کڵێسا دەگەڕاینەوە دیتبووم، لە نێو هوتێلەکەدا بە تەنیا دانیشتبوو، دەستەکانی نابوە نێو گیرفانی کۆتە چوار دوگمەییەکەیەوە و گوتی: «لەمە بەو لاوە هەتا کۆتاییی تەمەنت بیر لە من دەکەیتەوە. لە بەر ئەوەی ئەو دەرزییانەی لە وێنەکەی تۆم چەقاندبوو کەوتوونەتە خوارێ.

ئەم قسانەی بە شێوەیەکی ئەوەندە شیرین و هەستبزوێن بۆ کردم، ئەننەهوو ڕاستەقینەن، بەڵام تەنانەت ئەو ڕاستییەیش بۆ خۆی سەیر و ناسروشتی بوو. خێنو وا بە پێداگرییەوە گوتی: «ئەو قسەیەیشی هەر لە فلتەفلتی گواجیرابییەکان دەچێ.» خێنو پاش سێ مانگ لەگەڵ بەرپرسی کۆمپانیایەکدا ڕەدوو کەوت، دەبێ بڵێم کەسێکی وردبین و وریا بوو،

کاتێك ئەو یەکشەممەی مارتین پێی گوتم: «شتێکی باشە مرۆڤ لەوە ئاگادار بێ کە لە ماکاندۆدا کەسێك هەیە و بەردەوام بیر لەو دەکاتەوە.
چاوەکانی لە تووڕەییدا سوورسوور هەڵگەڕا بوون و ڕووی تێ کرد و پێی گوت: «بە تەما بە، بە خۆڕایی دڵی خۆت خۆش مەکە، دەبێ لەگەڵ ئەو کۆتە چواردوگمەیەتدا بە یەکەوە بڕزێن.



له ماکاندۆدا وەکوو پیاوێکی سەیروسەمەرە و بێ ڕۆح و دڵمردوو ناوی دەرکـرد، ئەگـەر چـی ئـەو پێـی خـۆش بـوو وەك پیـاوێکی دڵزینـدوو و خۆشمەشرەف، حەسـابی بـۆ بکرێـت، سـەرەڕای ئـەوەی وەك کەسـێکی ئاسـایی لـە نێـو خـەڵکی شـاردا دەژیـا، بـەڵام لەبـەر ئاکـارە دزێـو و چـەوتەکانی ڕابـردووی (کـە هـیچ شـتێك نـاتوانێ لـە بیرەوەریـی خەڵکـدا بیانسـڕێتەوە.) خـەڵکی لەگـەڵی دا بـاش نـەبوون و ڕوویـەکی خۆشـیان نەدەدایـە، وەك ئـاژەڵێکی دڕنـدە کـە سـەردەمێکی زۆر ون بـووبێ و لـە تاریکی و تەنیاییدا ژیا بێ و لەناکاو سەری هەڵدابێتەوە، بـەوردی لـە ژێـر چاوەدێرییاندا بوو، هەڵسوکەوتەکەی بە شێوەیەك بوو، کـە خـەڵکی شـار وەك ئاژەڵێك چاویان لێ دەکرد و لێی بە گومان و دڕدۆنگ بوون.

درەنگانێکی شەو لـە ئارایشـگا دەگـەڕاوە و دەچـوە نێـو وەتاغەکـەی و دەرگای لە سەر خۆی دادەخست، ماوەیەك بوو شەوانە نانی نـەدەخوارد، هەموو ئەندامانی بنەماڵە پێیـان وا بـوو لەبـەر ماندووبوونیـەتی نـانی پـێ ناخورێ و دەچێتە نێو هەڵۆرکەکەی و هەتا بەیانی لێـی دەخـەوێ، بـەڵام

پاش ماوەیەك تێگەییشتم شەوانە ڕووداوێکی سەیر لە ژوورەکەی دا ڕوودەدات. گوێم لە دەنگی هەنگاوەکانی دەبوو، بە شێوەیەکی زۆر نامۆ و بە پێدزە بە نێو ژوورەکەی دا دەهات و دەچوو، هەر وەك ئەوەی لە قووڵاییی شەودا دەبوە میوانی ڕۆحی مردوویەك، کە بەشێك بوە لە ڕابردووی ئەو. هەر دووکیان، یانی پیاوەکەی ڕابردوو و پیاوەکەی ئێستا، لە کپی و بێدەنگییەکی دا پێکدا هەڵدەشاخان، پیاوەکەی ئێستا بە توورەیییەوە، بەرگری لە کەسایەتی و بڕیاری نەگۆڕی خۆی دەکرد، هەتا خۆی لە دەستی پیاوەکەی ڕابردوو، کە ئەویش هەر بۆ خۆی بوو ڕزگار بکات. هەموو شەوێك هەتا دەمەو بەیان لە ژوورەکەی خۆی دا دەهات و دەچوو، دەتگوت ژانی کردوە، هەتا بە تەواوی ماندوو بوون و هەر دووکیان، ئەو و دوژمنە نادیارەکەی لە پێ دەخست.

لەو ڕۆژەوە پووزەوانەکانی وە لا نا و لە پێی نەکردن، بەردەوام هەموو ڕۆژێك دەچوە حەمام و جلوبەرگەکەی بۆنخۆش دەکرد، من تەنیا کەسێك بووم هەستم بەو گۆڕانە کردبوو. پاش دوو سێ مانگ، گۆڕانەکەی گەییشتە ئەو ڕادەیەی تەواو بۆی نیگەران ببووم و وردەوردە بەزەییم پێی دا دەهات و دڵم بۆی دەسووتا. هەر ڕواڵەت و جلوبەرگەکەی نێو شەقامەکانی نەبوو هەستی منی بریندار دەکرد، بەڵکوو ئەو فیکر و خەیاڵانە بوو کە شەوانە دەرگای دیوەکەی لە سەر خۆی دادەخست، پەرۆیەکی تەڕ دەکرد و قوڕ و خۆڵی پۆتینەکانی خاوێن دەکردەوە و بۆیەی لە پێڵاوەکانی دەدا. ئەو پێڵاوانەی لە چەند ساڵی ڕابردوودا ئەوەندەی لە پێ کردبوون ڕەنگیان بە ڕووەوە نەمابوو. لەوانەیش گرینگتر

ئەوە بوو، قوتووی بۆیە و فلّچەکەی لە بن دۆشەکەکەی دا دەشاردەوە، هەر وەك ئەوەی ئەوانە شتومەکێك بوون بۆی دەبوونە مایەی شەرمەزاری. ئەو شتانەیش لە سەردەمێکدا سەریان هەڵ دا، کە ئیتر پیاوەکان وردەوردە دەگەنە تەمەنی کامڵبوون و ڕوونتر لە ژیان و دەوروبەر دەڕوانن و کەمتر سەرنج دەدەنە شتە لاوەکییەکان و هەموو تواناکانیان بۆ کارە باشەکان دەخەنە گەڕ، بەڵام ئەو بە جێگای کارە پێویستییەکان، گەڕابوەوە بۆ کار و کرداری سەردەمی منداڵی و وەك تازە لاوەکان، زۆر خۆی بە جلوبەرگەکانییەوە ماندوو دەکرد و شەوانە هەتا درەنگانێکی شەو، هەر خەریکی ڕێکوپێککردنی لیباسەکانی بوو، بەڵام ئیتر ئەو سەردەمی جەوانی بە سەر چووبوو، هەتا خۆی بە هاوڕێیەکی خەیاڵییەوە بخافڵێنێ و دەردەدڵیی لەگەڵ بکات.

خەڵکی شار بە سەرنجەوە لە گۆڕانەکانی ئەویان دەڕوانی و بە وردی خستبوویانە ژێر چاوەدێرییەوە، لەبەر ئەوەی وردەوردە دەنگۆی ئەوە بڵاو بوەوە، کە شێت و شەیدای کچی ئارایشگەرەکەیە، نازانم ئەو دەنگۆیە ڕاست بوو یان نا، بەڵام بەربڵاویی ئەو دەنگۆیانە کارێکیان کرد کە تامەزرۆیی دەروونییەکانی ئەو بۆ ڕەگەزی بەرانبەر بە جوانی ببینم و هەستیان پێ بکەم.

هەموو دەمەو عەسرانێك خەڵکی دەیانبینی بەرەو ئارایشگاکە ملی ڕێی دەگرت و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژیش زیاتر بە خۆی ڕادەگەییشت و سەرنجی دەدایە جلوبەرگەکەی و زیاتر لێیان ورد دەبوەوە. کراسێکی ملیوان کورتی لە بەر دەکرد و دوگمە زەردەکەی سەر قۆڵەکەی دادەخست و

شەڵوارێکی پاك و خاوێنی ئوتووکراوی لە پێ دەکرد، قایشەکەی لە هیچ کامێك لە ئاڵقەکانی شەڵوارەکەی نەدەخست و هەروا بە سەر شەڵوارەکەی دا لە پشتی دەبەست. سەروسەکتی هەر لە داواکارێکی شپرێوشرۆڵ دەچوو، یان شێوەی خوازبێنیکەرێکی ناموراد و عاشقێکی دەدا کە بەردەوام، لە هەموو چاوپێکەوتنێکی دا لە بیری دەچووبێت چەپکەگوڵەکەی لەگەڵ خۆی بەرێت.

ژیانی ئەو لە مانگەکانی سەرەتای ساڵی ١٩٠٩ بەو شێوە تێ دەپەڕی و لە شاریشدا هێشتا دەنگۆکان بەردەوام بە سەر زارانەوە بوون و دەمبەدەم دەگەڕان و تەشەنەیان دەکرد. دەنگۆکان باسیان لەوە دەکرد، کە ئەو هەموو ڕۆژێك دەچێت و لە نێو ئارایشگاکەدا دادەنیشێ و لەگەڵ غەریبەکاندا دەست دەکات بە قسەوباس، بەڵام هیچ کەسێك نەبوو بە چاوی خۆی ئەوی کەرەتێك لەگەڵ کیژی ئارایشگەرەکەدا دیتبێ. هەستم بە دوور لە ڕاستی و بێ ڕەحمیی ئەو دەنگۆیانە کرد، تەواوی خەڵکی شار لەوە ئاگادار بوون کیژی ئەو ئارایشگەرە، پاش ساڵێك ئازارکێشان بە دەست ئەو قسە و دەنگۆیانەوە، تازە هەتا دەمرێ دەبێ ببێ بە بووکی دایکی و دەبێ لەو ماڵەدا پەلکەی سپی بهۆنێتەوە، لەبەر ئەوەی تارماییەك بەردەوام بە شوێنییەوە بوو، ئەو تارماییە ڕۆحی عاشقێکی نادیار و شاراوە بوو، بەردەوام خۆڵ و خاشاکی دەکرد بە سەر خواردنەکەی دا و ئاوی نێو ئاوخۆرییەکەی لیخن دەکرد و ئاوێنەکانی نێو ئارایشگاکەی لێڵ دەکرد و ئەوەندەی لێ دەدا هەتا سەروچاوی شین و ڕەش دادەگێڕا و تەواو ناحەزی دەکرد.

هـــەموو هەوڵـــەکانی تولەســـەگ، کـــە بـــە هەڵســـووڕانی عابـــا ســـپییە ئەفســـووناوییەکەیەوە و بـــە دۆعـــا و نوشـــتە و پاڕانـــەوە و لالآنەوەیـــەکی زۆرەوە بـــە ڕێـــوەی دەبـــردن، هـــیچ بەرهـــەم و دەســـتکەوتێکیان نـــەبوو. ئارایشـــگەرەکە لـــە دواهەوڵـــەکانی دا کیـــژە تەلیســـمکراوەکەی لـــە نێـــو وەتاغەکەدا حەشاردا، برنجی بـە چـواردەوری دا بـلاو کـردەوە و ناردییـە مـانگی هـەنگوینێکی خـەیالّی، بـە تـاقی تـەنیا دەینـاردە لای عاشـقە نادیارەکـەی، هـەتا کـار گەییشـتە ئـەو جێگایـەی پیاوەکـانی ماکانـدۆ دەیانگوت، کیژی ئارایشگەرەکە دووگیانە.

پاش ساڵێك، خەڵکەکە هەستیان کرد تازە نابیّ چاوەڕوانی ئەوە بـن ئـەو منداڵە لە دایك بیّ، ئیتر چاوەڕوانییەکەیان کۆتاییی پیّ هات و هاتنە سەر ئەو باوەڕەی دوکتۆر هەر لە دڵی خـۆی دا و بـە خـەیاڵ عاشـقی کچـەیە و هیچی ترلە گۆڕێدا نییە. هـەموویان بـەو ئاکامـە گەییشـتن، ئـەو کچـە ڕۆژ ڕەشە تەلیسم و جادوو کراوە، خۆی لە نێو وەتاغەکەی دا زیندانی کردوە و خەریکە وردەوردە دەتوێتەوە، هەر بەو هۆیانەوە دەمزانی تەواوی ئـەو قسانە دەنگۆیەکی نامرۆڤانە بوون کە بەدخوازان پلانیان بۆ داڕشتبوو. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٠٩ ئەو بەردەوام هەر هاتوچۆی ئارایشگای دەکرد و خـەڵکیش بـەردەوام هـەر خـەریکی قسەوقسـەڵۆك سـازکردن بـوون و خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون بۆ زەماوەند، هەتا بەشکەم کەسێك بێت و بڵیّ ئەو کاتـەی دوکتـۆر لـەویّ بـوو کچـەکەیش لـەویّ بـوە و بـە یەکـەوە دیومن، یان ئەوەی کەسێك ببێت و بڵیّ لـە کـاتی قسـەکردندا بـە یەکـەوە بینبیونی.

٤

٤

سێزدە ساڵ لەمەو بەر، لە مانگی سێپتامبەردا، ڕاست وەك ئەم مانگەی ئێستا تێی داین، هەوا زۆر گەرم و تاقەتپڕووکێن بوو، هیچ گیانلەبەرێك لە جێی خۆی نەدەبزوت، زڕدایکم خەریکی دوورینی جلوبەرگی بووکێنیی من بوو، هەموو ڕۆژێك ئەو کاتەی بابم دوای نەهار دەچوە دیوەکەی هەتا سەرخەوێك بشکێنێ، ئێمە لە لای گوڵدانەکانی تەنیشت لاجامەکەوە، لە نزیك وەجاخە گەرمەکە لە پەنای ئێکلیلە کێوییەکەدا دادەنیشتین. لە مانگی سێپتامبەر، لە سێزدە ساڵ لەمەو بەرەوە تەنانەت بەر لە ئەویش، من هەمیشە ئەو حاڵەتە تایبەتییەم بە سەردا دەهات، بڕیار بوو زەماوەندە کە زۆر گەورە نەکەینەوە، هیچ پەلەیەکمان نەبوو، بەکاوەخۆو وردەوردە خەریکی دوورینی جلوبەرگی زەماوەندەکەم بووین، من هەر لە بیری ئەو دیوەدا بووم، زۆرم حەز لەو دیوە بوو، ئەو وەتاغەی کە ڕوو بە شەقامەکە هەڵکەوتبوو، سوور بووم لە سەر ئەوەی بە زڕدایکم بڵێم، ئەو دیوە باشترین شوێنە بۆ مارتین، هەر لەبەر ئەوەیش پێم لە جەرگم نا و ئێوارەی ئەو ڕۆژە سفرەی دڵم بۆ زڕدایکم کردەوە.

زڕدایکم کە سەرگەرمی چنینی قەیتانێکی کەتانی بوو، تەواو ئاوێتەی شەپۆلە تاقەتپڕووکێنەکانی مانگی سێپتامبەر ببوو.

هەر لەبەر ئەوە گوتی: «نا!» بە دەم بیرەوەرییە ناخۆشەکانی هەشت ساڵ لەمەو بەرییەوە کە لە بەر چاوی دا دەهاتن و دەچوون، دەستی

کردەوە بە دروومانەکەی و گوتی: «لە خـودام تەمەننایـە لـەوە بـە دواوە هیچ کەسێك سەر بە نێو ئەو دیوەدا نەکات!

لە کۆتاییەکانی مانگی ژووئییەدا مارتین گەڕاوە، بـەلاّم لـە مـاڵی ئێمـەدا نەمایەوە، پێی خۆش بوو پاڵ بدات بە لاجامەکانەوە و چاو لە بەرانبـەری ببڕێت، پێی خۆش بوو بڵـێ: «حـەزم لێیـە تـەواوی تەمـەنم لـە ماکانـدۆدا بژیم.»

ئێوارانە لەگەڵ زڕدایکم دا بەرەو مەزراکان بە ڕێ دەکەوتین و لـە وەخـتی نانخواردنی شەوێدا، بەر لە چـراهەڵکرانی شـار، دەگەڕاینـەوە، ئـەو کاتـە مارتین دەیگوت: «ئەگەر لە بەر تۆ نەبوایە، بە دڵنیاییەوە لـە ماکانـدۆدا دەمامەوە.» دیار بوو ئەو قسەی لە ناخی دڵییەوە هەڵدەقوڵی، ئەو کاتـە چوار ساڵ بـوو دوکتـۆر لـە مـاڵی ئێمـە ڕۆیشـتبوو، ڕاسـت ئـەو عەسـرەی دوورینی جلوبەرگەکەمان دەست پێ کرد، زڕدایکم بۆ یەکەمین جار باسـی ڕەفتاری سەیروسەمەرەی دوکتۆری بۆ کردم.

گوتی: «پێنج ساڵ لەمەو بەر وەك ئاژەڵێك لە نێو ئەو وەتاغەدا دەژیـا... بـا ئـەوەیش بڵـێم ئـەو تـەنیا هـەر ئاژەڵێـك نـەبوو، بـەڵکوو شـتێکی سەیروسـەمەرەتر بـوو... ئـاژەڵێکی گیـاخۆر بـوو، ئاژەڵێـك کـە کاوێـژی دەکرد و وەکوو گایەك دەچوو کە نیرێکیان لە ئەسـتۆی بەسـتبێ، ئەگـەر لەگەڵ کیژی ئارایشگەرەکەدا زەماوەندی بکردایە ئـەو ڕووداوانـە ڕوویـان نەدەدا. لەگەڵ ئەو حیلەبازەی ڕیوەڵەدا کارێکی وایان کرد هەموو خەڵکی شار باوەڕیان هێنابوو کە لەگەڵ ئەهریمەندا مانگی هـەنگوونێکی ناخۆشـی هەبوە، مانگێکی پڕ لە ئـازاری ڕابـواردوە و هـەر لـەوێیش دووگیـان بـوە،

بەڵام دوکتۆر لەناکاو پێی لە ئارایشگاکە بڕی و هاتوچۆی نەکرد و لە کردار و ڕەفتاری ئەودا گۆڕانێکی گرینگ پێك هات. ئەو گۆڕانە، سەردەمێکی نوێ بوو، ئەو ڕێگایەی گرتبوویە پێش و بەردەوامیش خەریك بوو پلانی بۆ دادەڕشت... هەر بابت بوو ڕازی بوو پیاوێك بەو کردەوە ناحەز و نالەبارەیەوە لە ماڵەکەی دا بمێنێتەوە و وەك ئاژەڵێك بژی، باسی ئەو بێئابڕووییەی کە هەموو شاری پڕ کردبوو، کارێکی وای کرد، هەموو خەڵکی شار پێیان وا بێ ئێمە مرۆڤگەلێکی سووك و سەرسەرین و ڕێز لە دابونەریت و بەها مرۆییەکان ناگرین و هەموو یاسا کۆمەڵایەتییەکانمان لە ژێر پێ ناوە. فێڵ و تەڵەکەکانی ئەو پیاوە بە ڕۆیشتنی مێمێ کۆتایی هات، بەڵام بابت سەرەڕای ئەوەیش هەر لە سەر قسەی خۆی سوور بوو پێی لە هەڵەکەی خۆی نەدەنا.

گوتم: «من هەر ئاگایشم لەو شتانە نەبوو.»

ئەو هەرا و هەنگامەی کوللەکان لە حەوشە وەڕێیان خستبوو هەر لە دەنگی دووکانی دارتاشی دەچوو. زڕدایکم بە دەم قسەکردنەوە بێ ئەوەی سەر هەڵبێنێ خەریکی داگرتنەوەی لێواری کەتانەکە بوو، گوتی: «ئەو شەوە هەموومان لە پشت مێزەکە دانیشتبووین. (هەموومان بێجگە لەو، لەبەر ئەوەی لەو ڕۆژە بەو لاوە کە لە ئارایشگاکە گەڕایەوە بڕیاری دا ئیتر هیچ کاتێك سەر بەوێدا نەکاتەوە، شەوانەیش دەمی لە نان و ئاو نەدەدا.) کاتێك مێمێ هاتە دیوی نانخواردنەکە، دەنگی گۆڕابوو، پێم گوت مێمێ چی ڕووی داوە؟ لە وەڵامدا گوتی هیچ نییە، پێت وایە شتێك ڕووی داوە؟ بەڵام هەر چی لێم دەڕوانی ئەو هیچ چاکی نەدەگوت،

لە لای چراکەوە هەر دەجوولاوە و زەوت نەدەبوو، دەتگوت ژانی کردوە و ڕەنگی بە ڕووخسارەوە نەمابوو، پێم گوت: «بۆت بمرم مێمێ، ئەوە بۆ وات لێ هات.» بەلام ئەو بە هەر شێوەیەك بێ ددانی بە جەرگی دا گرت و، بە سەر خۆی دا زاڵ بوو، هەتا ئەو کاتەی لە وەختی گەڕانەوەی بۆ نێو چێشتخانە ئاوڕی داوە، ئەو کاتە بابت، هەستی بەشتێك کردبوو، پێی گوت، ئەگەر ناساغی بچۆ دیوەکەی خۆت تاوێك ڕابکشێ، بەلام ئەو هیچی نەگوت. مێمێ کەشەفەکەی دەست دایە و بەرەو چێشتخانە بە ڕێ کەوت... پشتی لە ئێمە بوو... هەتا ئەو کاتەی قاپ و کەوچکەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە، مێمێ لە چێشتخانەکەدا پاڵی دابوو بە دیوارەکەوە، لەو کاتەدا بابت هەستا و چوو هەتا دوکتۆر بهێنێ چاوێکی لێ بکات. لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەی لە ماڵی ئێمەدا باروبنەی لێ خستبوو، ئەوە یەکەمین جار بوو پێویستیمان پێی دەبوو، هەموو ژنەکان چوونە ژوورەکەی مێمێ هەتا بە ئالکۆڵ هەندێك گیانی بۆ داماڵین و چاوەڕوان بین هەتا بابت دەگەڕێتەوە، بەلام چاوەڕوانییەکەمان بێهوودە بوو... ئیزابێل، ئەو پیاوە هەر نەهات چاوێکیش لە مێمێ بکات، ئەویش کەسێك چووبوو بە شوێنی دا، کە ماوەی هەشت ساڵ جێگا و نان و ئاوی دابوویێ و وەك چاوی خۆی پاراستبووی.

هەر کاتێك ئەو ڕۆژەم بیر دێتەوە، هەست دەکەم هاتنی ئەو پیاوە، بەلایەکی خودایی بوە و لە ئاسمانەوە بۆ ئێمە هاتۆتە خوارێ، هەست دەکەم تەواوی ئەو نیگەرانی و ترس و لەرز و دڵەکوتێیە، ئەزموونێك بوە خودا ئێمەی پێ تاقی کردۆتەوە، هەتا ئێمە بزانین دونیا شتێکی ئەوەندە

بە نرخ نییە، هەر وەك ئەوە وایە ئێمە هەشت ساڵ میوانداریی بەرازێکمان کردبێ و جلوبەرگ و پاکوخاوێنیمان بۆ ڕاگرتبێ. مێمێ خەریك بوو دەمرد (لانی کەم ئێمە پێمان وا بوو خەریکە دەمرێ.) و ئەو پیاوەیش ڕاست لەو کاتوساتە ئەستەمەدا دەرگای لە سەر خۆی داخست و ئامادە نەبوو هەنگاوێکمان بۆ هەڵ بهێنێتەوە، ئەگەر ئەو کارەیشی بکردایە، کردەوەیەکی مرۆڤدۆستانە نەبوو، بەڵکوو بۆ ڕێزگرتن و ئەمەکداری لە مرۆڤگەلێك بوو، کە ماوەیەکی یەکجار دوورودرێژ ڕێزیان لێ گرتبوو و ئاگاداریان لێ کردبوو. درەنگانێکی شەو بابت گەڕاوە و بە ناڕەحەتییەوە گوتی، بە ئالکۆل گیانی بۆ داماڵن... چاوەڕوانی داو و دەرمان و دوکتۆر مەبن، هەر دەتگوت لە ئاوێکی ساردیان هەڵکێشام، مێمێ بە دەم داماڵینەکەوە وردەوردە گیانی وە بەر دەهاتەوە و دەژیاوە، من بە توورەییەوە هاوارم کرد. ئالکۆل و هیچی تر؟!... بەرەبەرە ئێمە لەشمان بۆ دادەماڵی و ئەویش دەهاتەوە سەر خۆ، یانی ئەو کارە ئەوی نەدەهێنا ئێمە هەشت ساڵی تەواو ئازاری بۆ بچێژین و خۆی پێوە ماندوو بکەین؟! بابیشت کە هەر دەیویست بە ڕووی خۆی نەهێنێ و خۆی نەشکێنێ، بە میهرەبانییەکی سارد و دەستکردەوە گوتی: «ئیرادی نییە، سەری خۆتی پێوە مەئێشێنە، ڕۆژێك دەزانی لەبەر چی بوە.

ئەو دوانیوەڕۆیە زڕدایکم دەنگی لێ هەڵبڕی بوو، زۆر بە توورەییەوە قسەی دەکرد، دیار بوو ڕووداوەکەی ئەو شەوە سەر لە نوێ هاتبوەوە بەر چاوی.

بریسکەبریسکی ئەو ئەکلیلە کێوییانەی مانگی سێپتامبەر، خەواڵوویبوونی کوللەکان و هاسکەهاسکی ئەو پیاوانەی کە بە زەحمەت خەریك بوون دەرگایەکیان لەو گەڕەکەدا لە گرێژە نەدەبرد، وردەوردە خەریك بوون بێدەنگ دەبوون.

زڕدایکم گوتی: «ئەو یەکشەممەی مێمێ وەك خاتوونێکی تەواو و کەماڵ خۆی ڕازاندبووەوە و لە ڕێوڕەسمی شەوی پیرۆزدا بەشداریی دەکرد، ئێستایش لە بەر چاومە و هەر دەڵێی دوێنەیە. چەترێکی دژەهەتاوی ڕەنگاوڕەنگی بە دەستەوە بوو... مێمێ، مێمێ... ئەو کارە وەك نەفرەت و غەززەبی خودا وابوو، ئێمە ئەومان لە هەلومەرجێکدا لە دەست دایك و بابی ڕزگار کرد هەر لەوانە بوو لە بەر بێنانی لە برسا قڕی بێ، ئاگادارمان کردبوو، شوێنی حەوانەوە و نان و ئاومان دابوویە و تەنانەت ناویشمان لێ نابوو، بەڵام لێرەیشدا دەستی قەدەر کاری خۆی کرد، بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە لە بەر دەرگای خۆمان دیتم، چاوەڕوانی سووورپێستەکان بوو هەتا بێن و چەمەدانەکانی بۆ ڕاگوێزن، ئێمە هەر نەمان دەزانی ئەو بەرەو کوێ دەڕوات، تەواو گۆڕابوو نەدەناسرایەوە، زۆر بە خۆی دەنازی و بادیهەوا ببوو، بە پۆزێکەوە ڕاوەستابوو لەگەڵ بابت قسەی دەکرد، بۆ ئەم کارانە هیچ ڕاوێژێکیان لەگەڵ مندا کردبوو. هەر وەك ئەوەی من وێنەی بووکەڵەیەك بم و لە سەر دیوارەکەدا کێشرابێتمەوە. بێ ئەوەی هەر بە بای خەیاڵیشم دابێ خەریکە چی ڕوو دەدات و خۆم بەو کارانەوە ماندوو بکەم، بابت هات و پێی گوتم، کارت بە مێمێ نەدابێ، ئەو لێرە دەڕوا، بەڵام لەوانەیە پاش ماوەیەکی تر بگەڕێتەوە... لێم پرسی، بۆ کوێ

دەچی؟ بەڵام ئەو هیچ وەڵامێکی نەدامەوە. بە کورسییە دارینەکانییەوە لێی دا و ڕۆیشت، هەر وەك ئەوەی من هاوسەری ئەو نەبم و بەڵکوو وێنەی بووکەڵەیەك بم و لە سەر دیوارێك کێشرابێتمەوە!»

زڕدایکم درێژەی دایە: «لە پاش دوو ڕۆژ زانیم ئەو ناپیاوەیش بەیانیی ئەو ڕۆژە ڕۆیشتبوو. بێ ئەوەی تەنانەت خوداحافیزییەکی بێ بایەخیشی لێ کردبێتین. هەر وەك ئەوەی ماڵی خۆی بوە و پاش هەشت ساڵ ملی ڕێی گرتۆتە بەر و ڕۆیشتوە. هەر وەك لە ماڵی خۆی بچێتە دەرەوە. بێ ئەوەی ماڵئاوایی بکات، بێ ئەوەی شتێك بڵێ... وەك دزان، من پێم وابوو لەبەر ئەوەی بۆ دەرمانکردنی مێمێ نەهاتوە بابت جوابی کردوە، بەڵام کاتێك ئەو ڕۆژە لە بابتم پرسی، هەر ئەوەندەی گوت کە: «من و تۆ دەبێ دابنیشین و بە درێژی باسی ئەو ڕووداوە بکەین!... ئێستا ئەوە چوار ساڵ بە سەر ئەو ڕۆژەدا تێ پەڕیوە، بێ ئەوەی لەو بابەتەوە قسەیەکمان کردبێ.

هەر لەبەر چاوی بابت و لە نێو ئەو ماڵە گەورەیەدا شتی وا ڕوو دەدات، ئەویش لە ماڵێکدا کە لێپرسینەوە نییە و هەر کەسێك هەر کارێك پێی خۆش بێ دەیکات. لە ماکاندۆ ئەوە ببوە بنێشتە خۆشەی هەموو زارێك و من هێشتا نەم دەزانی مێمێ بەو شێوە ناحەزە چۆتە کڵێسا و هەتا سەرێك بێ لە نێو سەراندا و وەك ژنێکی قرتی و هەرزە، لە نێو سەرەژنەکاندا شوێنێك بۆ خۆی دیاری کات. بابیشت ورەی وە بەر خۆی نابوو دەستی گرتبوو لە گۆڕەپانەکە پەڕاندبوویەوە ئەو بەر، هەر لەو سەروبەندەدا هەواڵم زانی، وەك من بیرم لێ دەکردەوە وا نەبوە زۆر دوور

نەڕۆیشتوە و لەگەڵ دوکتۆر لەو ماڵە دوو نەفشەی سەر کۆڵانەکەدا بە یەکەوە دەژیان. هەر وەك دوو بەراز ژیانی هاوبەشیان پێك هێنابوو، هەر سەریشیان نەکردبوو بە کڵێسادا. سەرەڕای ئەوەی مێمێ وسڵی پاکبوونەوەی کردبوو، ڕۆژێك بە بابتم گوت خودا تۆڵەی ئەو کارە ناحەزەیان لێ دەکاتەوەو ئەویش هیچ وەڵامێکی نەدامەوە و هەر وا ئارام و لەسەرەخۆ دانیشتبوو، وەك ئەوەی نەبای دیبێ و نەبۆران. تەنانەت پاش ئەوەی ئەو ئابڕووچوونەی لێ ئاشکرا ببوو سەرە چەرمەکە ئاو بردبووی... سەرەڕای ئەوانەیش لە ناخی دڵمەوە ڕازیم کارەکان بەو شێوە کۆتاییان پێ هات و دوکتۆر لێرە ڕۆیشت. ئەگەر ئەوە ڕووی نەدایە، ئەو گەندەپیاوە ئێستایش هەر لەو وەتاغەدا بۆی کەوتبوو. کاتێك زانیم ئێرەی چۆڵ کردوە و هەموو کەلوپەلەکەی لە چەمەدانێك ناوە و ڕۆیشتوە، لە ناخی دەروونەوە هەناسەیەکی بە ئاسوودەییم هەڵکێشا، بە ئاواتی دڵم گەیشتبووم.

سەرەڕای ئەوەی ماوەی هەشت ساڵ بوو چاوەڕوانیی ئەو ساتەوەختەم دەکێشا، پاش دوو حەوتوو، مێمێ دووکانێکی دانا و مەکینەیەکی دروومانی بوو، بەو پووڵەی لەم ماڵەدا خستبوویە سەر یەك «دامستیکێکی» تازەیشی کڕیبوو، ئەو کارەیم بە بێڕێزی بەرانبەر بە خۆمان دەزانی و بە گوێی بابیشتم دادا، سەرەڕای ئەوەی هیچ وەڵامێکیشی نەدامەوە بە جێگای ئەوەی لەو کارە تووڕە و ناڕەحەت بێ، زۆریشی پێ خۆش بوو، هەر وەك ئەوەی پێی وابوو (بەو هەموو لەخۆبردووییە و فیکر و هۆش و دڵئاوایی و بێ عەقڵیەشییەوە) پێی وابوو

بەو کارە دزێو و ناحەزانەیەوە شوێنێکی لە بەهەشت بۆ خۆی مسۆگەر کردوە. پێم گوت: تا ئێستا ئەوەی کردوتە و خۆت پێوە ماندوو کردوە بۆتە ڕەنجی قالۆنچە و لە پێناوی ئەو بەرازانەدا بە فیڕۆ چوە، کەچی ئەو وەك هەمیشە ئارام و لەسەرخۆ گوتی: «ڕۆژێك هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوە.»

بـە پێـی گێڕانـەوەی کتێبێـك، دێسـامبەر وەك بـەهارێکی چـاوەڕوان نەکراو گەییشتێ و مارتینیش لەگەڵ ئەودا سەری هەڵ دا.

پـاش فـراوێن هـات بـۆ مـاڵی ئێمـە، بـە چـەمەدانێك و کۆتـە چواردوگمەکەیەوە، ئەم جاریان خاوێن و ئوتـوو کرابـوو... هیچی بـە مـن نـەگوت، یەکڕاسـت چـوە نووسـینگەکەی بـابم، هـەتا لەگـەڵ ئـەودا قسـە بکات، پێشتر زەماوەندەکە بۆ یەکێك لە ڕۆژەکانی مـانگی ژووئیـە دیـاری کرابوو، بەڵام دوو ڕۆژ لە پاش گەڕانەوەی مارتین، لە مانگی سێپتامبەردا، بابم دایکمی بانگ کرد و پێی گوت زەماوەندەکە لە ڕۆژی دووشەممەدا بـە ڕێوە دەچێ، ئەو ڕۆژەی زڕدایکمی بانگ کرد، شەممە بوو.

جلوبەرگی بووکێنییەکەی من کارێکی وای نەمابوو، مارتین هـەموو ڕۆژێـك دەهـات بـۆ مـاڵی ئێمـە. لەگـەڵ بـابم قسـەی دەکـرد و ئـەویش لـە کـاتی نانخواردندا بۆ چوونەکانی ئەوی بۆ ئێمـە دەگێـڕاوە. مـن دەسـگیرانەکەم باش نەدەناسی، هیچ کاتێك دوو بـە دوو بـە یەکـەوە دانەنیشـتبووین دوو قسە بکەین، بەو حاڵەیشـەوە لـە نێـوان بـابم و مارتینـدا دۆسـتایەتییەکی

گەرم و پتەو بیچمی داکوتا بوو، بابم بە شێوەیەك لەگەڵی تێکەڵ ببوو ئەننەهو بڕیارە ئەو لەگەڵ مارتیندا زەماوەند بکات، نەوەك من. سەرەڕای ئەوەی بەرەبەرە لە ڕۆژی زەماوەندەکە نزیك دەبووینەوە، هیچ شادی و خۆشییەك دەروونی دانەگرتبووم، بەڵام هێشتا من هەر لە کەشوهەوای ئەو ڕۆژگارەدا دەژیام کە مارتین، ڕێکوپێك و پاك و خاوێن، دەستەکانی ڕادەوەشاند و قسەی دەکرد و دوگمەکانی کۆتە چواردوگمەکەی دەکردەوە و دەیبەستنەوە.

ڕۆژی یەکشەممە پێکەوە نانوچای نێوەڕۆمان خوارد، زڕدایکم بە شێوەیەك کورسییەکانی دانابوو، مارتین شانبەشانی بابم دانیشتبوو، سێ کورسی کەوتبوونە نێوان من و ئەوەوە. لە ماوەی نانخواردنەکەدا من و زڕدایکم بێدەنگ بووین. مارتین و بابم لە بابەت بارودۆخی ئابووری و کارەوە قسەیان دەکرد و من سێ کورسی لەو لای ئەوانەوە دانیشتبووم و بە سەرنجەوە لە پیاوێکم دەڕوانی کە لە ساڵی داهاتوودا دەبوە بابی منداڵەکەم و من هیچ هەستێکم بەرانبەری ئەو نەبوو.

لە ژووری نووستنەکەی زڕدایکم دا شەوی یەکشەممە، جلوبەرگی بووکێنییەکەم تاقی دەکردەوە، وێنەکەم لە ئاوێنەکەدا بێڕەنگ و پاکوخاوێن بوو، هەورێکی سپی کە هەر لە تۆزی ئارد دەچوو دەوروپشتی تەنیبووم، ئەوە ڕۆحی دایکمی بیر دەهێنامەوە، لە نێو ئاوێنەکەدا بە خۆمم گوت: «ئەوە منم، ئیزابێل، ئێستا وەك بووکێك جلوبەرگم پۆشیوە، کە بڕیار وایە بەیانی ڕۆژی زەماوەندەکەی بێ.

خۆم نەدەناسییەوە، هەستم دەکرد یاد و بیرەوەرییەکانی دایکم لە سەر لەشم قورسایی دەکەن. مێمیَ چەند ڕۆژێك لەمەو بەر، ڕاست ئا لێرانەدا، لە بارەی ئەوەوە قسەی بۆ کردبووم، بۆی گێڕابوومەوە کە پاش لەدایکبوونم، دایکم جلوبەرگی بووکێنیی لە بەردا بوە و لە نێو تابووتەکەدا ڕاکشابوو، ئێستا کە لە نێو ئاوێنەکەدا لە خۆم دەڕوانم، جەستەی دایکم دێتە بەر چاوم، کە لە نێو پارچەیەکی کەتانی چرچولۆچ و تەپوتۆزاویدا، لە ئامێزی گۆڕدا ڕاکشاوە.

من لە دەرەوەی ئاوێنەکەدا بووم و دایکیشم لە نێو ئاوێنەکەدا ڕاوەستابوو، هێشتا زیندوو بوو، چاوی لیَ دەکردم. دەستەکانی درێژ دەکرد و هەوڵی دەدا هەست بەو مەرگە بکات کە بە یەکەم ئاڵقەکانی تارای بووکێنییەکەی منەوە نووسابوو، ڕاست لە پشتە سەری منەوە، بابم لە ناوەڕاستی ژووری نووستنەکەدا، بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «لە نێو ئەو جلوبەرگە بووکێنییەدا ڕاست وەك خۆی دەچی.

ئەو شەوە من یەکەم نامەی ئەوینداری و لە ڕاستیدا ئەوەڵین و دوایین نامە گەییشتە دەستم، پەیامێك بوو لە لایەن مارتینەوە کە بە پێنووس لە پشت بەرنامەی سینەمادا نووسرابوو، نووسیبووی: «لە بەر ئەوەی ناتوانم ئەمشەو لە کاتی دیاریکراودا خۆم بگەیەنمە ئەویَ بەیانی زوو لە کاتی دانیپێدانانندا خۆم دەگەیەنمە لاتان و بە سەرهەنگیش بڵێن ئەو شتەی کە لە بابەتییەوە قسەمان کردبوو جێبەجیَ کراوە، بەو هۆیەوە ناتوانم خۆم بگەیەنمە لاتان. ئەری بە ڕاستی تۆ دەترسی؟! (م)

بە خوێندنەوەی ئەو نامەیە وەك ئەوەی دەمیان پڕ كردبێتم لـە ئـاردێكی بێتـام، چـووم بـۆ ژووری نووسـتنەكەم، پـاش دووسـێ كاتـژمێر كاتێـك زرِدایكم هات و لە خەوی هەستاندم، هێشـتا دەمـم هـەر تـامی تـاڵی تێـدا بوو.

ماوەیەكی زۆری پێ چوو هەتا هاتمەوە سـەرخۆ و بـە تـەواوی بـە خەبـەر هـاتم. لـە نێـو ئـەو جلوبەرگـە بووكێنییـەدا، هەسـتم كـرد دەوروبـەرم بـە شووبایی شێداری بەیانییەك تەنراوە، كە بـۆنی میسـكی لێـوە دێ، دەمـم وشك ببوو، ڕاست وەك ئەو كاتەی مـرۆڤ سـەفەرێك دەسـت پـێ دەكـات و نانێكی لە زاردایە و بە ئاوی نێو دەمی تەڕی دەكات و هەر چـەندە هـەوڵ دەدا بۆی ناخووسـێ. ڕێوڕەسمەكـە لـە كاتـژمێر چـواری دوانیـوەڕۆدا لـە هۆڵی میوانداریدا دەستی پـێ كردبـوو. مـن هـەموو میوانـەكانم دەناسـی، بەڵام بە لای منەوە تەواو گۆڕرا بوون و وەك غـەوارە دەهاتـە بـەر چاوم. پیاوەكـان كۆتوشـەڵواریان لـە بـەر كردبـوو، ژنـەكانیش كڵاویـان كردبـوە سەریان و قسەیان دەكرد.

كڵێساكە خـەڵكێكی وای لـێ نـەبوو. منـیش وەك لاوێكـی متفـەڕككراو كـە بـەرەو شـوێنی قوربـانیكردنی دەبـەن. بـە نێـو ڕێڕەوەكـەی ناوەڕاسـتدا دەڕۆیشتمە پێشێ و چـەند ژنێـك سـەریان بـەرەو لای مـن وەرسـووڕاند و چاویان لـێ كـردم. تولەسـەگ، بـەو جەسـتە ڕێوەڵەیـەوە بـە پۆزێكـەوە ڕاوەستابوو، تەنیا كەسێك بوو لە نێو ئەو خەونە ئـاڵۆز و پـڕ لـە ژاوەژاوە دەدا، ڕوونتر و ڕاستیتر دەهاتە بـەر چـاو، لـە پلیكانـەكانی میحرابەكـەوە هاتە خوارێ بەو دەستە لاوازانەیەوە دەستی دام بـە دەسـتی مارتینـەوە.

مارتینیش لەسەرەخۆ و لێو بە بزە شانبەشانم ڕاوەستابوو. هەر بەو شێوەیەی لە ڕێورەسمی شەوبێداری منداڵەکەی پالۆکۆیمادۆدا دیتبووم، بەڵام لێرەدا کراسێکی ملیوان کورتی لە بەردا بوو، وەك ئەوەی بیەوێ بە منی بسەلمێنێ، زۆر بە دەوری خۆی دا هاتوە، هەتا لە ڕۆژی زەماوەندەکەدا خەیاڵی تر لە ڕۆژە ئاساییەکان بێتە بەر چاو.

بەیانی ئەو ڕۆژە، کاتێك گەڕاینەوە بۆ ماڵێ و پاش ئەوەی برازاواکان نان و چاییی بەیانییان خوارد و لەگەڵ یەکدا گەرمی قسە بوون، مێردەکەم ڕۆیشتە دەرێ و هەتا کاتی خەوی دوانیوەڕۆ سەری بە ماڵێدا نەکردەوە. زڕدایکم و بابم منیان هەر بە بای خەیاڵیشدا نەدەهات و ئاوڕێکیشیان لێ نەدامەوە، ئەوان کارێکیان کرد ڕۆژەکە بە شێوەیەك تێپەڕێت و هەست بەوە نەکرێ ئەو دووشەممەیە نامۆ و نائاسایی بێتە بەر چاو. کراسی بووکێنییەکەم داکەند و لە نێو کۆمێدەکەم خست، لەو کاتەدا لە فیکری دایکم دا بووم، بیرم لەوە دەکردەوە: «لانی کەم هەر نەبێ ئەم شرۆشیتاڵانە بە کاری ڕۆژی مردنەکەم دێن.

کاکی بە ڕواڵەت زاوا، کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ گەڕایەوە بۆ ماڵێ و گوتی نەهاریشی خواردوە، کاتێك چاوم لێ کرد، قژی کورت کردبوەوە، لە بەر خۆمەوە گوتم، ئەم مانگی سێپتامبەرە بە شادی و خۆشی دەگوزەرێ. مارتین لە تەنیشتمەوە دانیشت و ماوەیەکمان بە بێ دەنگی تێپەڕ کرد. ماوەیەك بەو شێوەیە لە لای یەکەوە دانیشتین. بۆ یەکەمین جار لە ماوەی تەمەنم دا لە هاتنی شەو دەترسام. لەوانەیە ڕووخسارم

ئەوەی درکاندبێ. وەك ئەوەی مارتین لەناکاو هەستی پێ کردبێ، سەری هێنا بن گوێم و گوتی: «بیر لە چی دەکەیتەوە. ؟

هەستم کرد شتێك دەست دەخاتە دڵمەوە، ئەم غەوارەیە بە شێوەیەکی خۆمانە و هاوڕێیانە لەگەڵم دەدوا. سەرم هەڵبڕی و لەو شوێنەی کە سێپتامبەر لە تۆپێکی گەورەی زێڕین و مانگێکی گەورەی بلوورین دەچوو ڕوانیم و گوتم: «بیرم لەوە دەکردەوە ئەوەی لە هەموو شتێك بۆ ئێمە گرینگترە و پێویستیمان پێیەتی، بارینی بارانێکە.

£

£

ئەو ئاخرین شەوەی لە بەر هەیوانەکە دانیشتبووین و قسەمان دەکرد، هەوا زۆر لە شەوەکانی تر شێدارتر بوو. دووسێ ڕۆژێك دوای ئەو شەوە لە ئاراییشگا گەڕایەوە خۆی کرد بە دیوەکەی خۆی دا، بێ ئەوەی ئاوڕێك لە پشتە سەری بداتەوە، دەرگاکەی لە سەر خۆی پێوە دا. ئەو شەوەی لە بەر هەیوان دانیشتبووین، شەوێکی گەرم و تاقەتپڕووکێن بوو، لەو دەگمەن شەوانە بوو کە ئامێزی ژیان لێوڕێژ بوو لە خۆشەویستی و مرۆڤدۆستی. ئەوەی لە نێو ئەو گڕە مشقەڵانەدا هەست بە زیندووبوونی دەکرا، جیکەجیکی ئەو سیرسرکانە بوو کە لە هەناوی وشکی سروشتەوە هەڵدەستا و جووڵەجووڵ و خشەخشی بەردەوامی ئەکلیلە چیایی و سمڵە هیندییەکان بوو کە لەو کاتەدا دەسووتان.

هەر دووکمان بە یەکەوە بێدەنگ بووین و ئەو شیلە لیچقنەی لە لەشمان هەڵدەقوڵی ئارەقە نەبوو، بەڵکوو ژەهراوی مادەیەکی زیندووی بزۆز بوو، کە لە لەشمانەوە هەڵدەقوڵی و بە گیانمان دا چۆڕاوگەی دەبەست.

ئەو جاروبارە سەری هەڵدەهێنا و لە بۆشاییی ئاسمانی ساماڵ و پرشنگدارەی هاویندا سەیری ئەستێرەکانی دەکرد و پاشان بێدەنگ دەبوو، هەر دەتگوت خۆی داوەتە دەست ئەو شەوە ماتەی کە زیاتر لە دێوەزمەیەکی گیاندار دەچوو، ئەوە حاڵوباڵی ئێمە بوو... نوقمی دەریای فیکر و خەیاڵ، بەرانبەر بە یەکتری، ئەو لە سەر کورسییەکی کەوڵ و من لە سەر کورسییەکی بێشکەئاسا دانیشتبووین، لە ناکاودا دیتم مات و مەلوول سەرەکزەلۆکەلەی بە لای شانی چەپەی دا لارەوە بوە، لەو کاتەدا بیرم لە ژیانی ئەو دەکردەوە... لە بێکەسییەکەی، لەو ئازار و ژان و پەرێشانییەی کە وەك داوی جاڵجاڵووکە بەری ڕوانگەی ژیانیان لێ تەنیبوو، ئەویش لە نێو ئەوانەوە لە ژیان دەڕوانێت.. لەو کاتەدا هەستم کرد وردەوردە خەریکم هۆگری دەبم و خۆشم دەوێ. هەستم کرد لە هەناوم دا هێزێکی ئەفسووناوییم دیوەتەوە هانم دەدا لە پەنای خۆمەوە دای بنێم ولە ئامێزم دا بیحەسێنمەوە، ئەو ئازارانەی لە نێو دیوە تاریکوتنۆکەکەی دا دەیکێشا، وەك برینێکی بە سۆم دەهاتە بەر چاو. هەستم کرد ژیان وەك بەرداشێك دەیساوێتەوە و ئازاری دەدا. چاوە زەرد و بێڕەحمەکانی دڵنیایان کردم کاتی ئەوە هاتوە، هەتا بەئەسپایی سەرێك بکێشمە ئەو دیوی پەردەی ژیانییەوە. بێ دوودڵی و بێ ئەوەی

بیرم لە ناکامی کارەکەم بکەمەوە، لێم پرسی: «دوکتۆر، تکایە ئەوەم بە ڕوونی پێ بڵێ. تۆ بڕوات بە بوونی خودا هەیە؟

هەندێکی لێ ڕوانیم، قژە ئاڵۆزکاوەکەی بە نێو چاوانی دا هاتبوە خوارەوە، وەك پرشنگی تیشکێك لێلاییی دەروونی ئاشکرا دەکرد. لە ڕووخساری دا هەست بە دەستەوەسانی نەدەکرا، وەك پیاوێکی ژیر و زانا ڕووی تێ کردم و گوتی: «ئەوە یەکەمین کەڕەتە کەسێك پرسیاری ئاوام لێ دەکات.»

_ «بۆ خۆت چی دوکتۆر؟!... خۆشت هیچ کاتێك ئەو پرسیارەت لە خۆت نەکردوە؟

وەڵامێکی ڕوونی نەدامەوە، نەم زانی بۆی گرینگە یان نا، وا دیار بوو ئەوەی بە لایەوە گرینگ بوو خۆم بووم. پرسیارەکانمی بە لاوە گرینگ نەبوو، سەرنجێکی وای نەدەدانێ. گوتی: «پرسیارێکی سەختە.

پێم خۆش بوو بزانم شەوێکی ئاو هەراسانت ناکات؟ هەست بەوە ناکەی گیانلەبەرێکی مەزن و بەهێزتر لە هەموومان لە نێو ئەو مەزرایانەدایە و دێت و دەچێت، بە جووڵانەوەی ئەو بوونەوەرە شتێك وە جووڵە ناکەوێ و تەواوی شتەکان گێژ و سەرگەردانن؟

هیچی نەگوت. لەو لای حەوشەکەوە بۆنی ژیان و مرۆڤ لە پنجی یاسەمەنێکەوە هەڵدەستێ، ئەو یاسەمینەی بە یادی هاوسەرەکەی ئەوەڵمەوە چاندبووم. دەنگی سیسرکە دەوروپشتمانی داگرتبوو، بوونەوەرێکی بێ کێش و پێوانە بە تەنیایی بە نێو دڵی شەودا پیاسەی دەکرد.

_ «سەرهەنگ، پێم وا نییە ئەو شتانە شوێن لە سەر من دابنێن و ببنە هۆی پەرێشانیم.

ئێستا ئەویش مات و سەرگەردان بوو، وەکوو ئەکلێلی چیایی و سملّی هێندی لە شوێنە سوورەوە بوەکەی خۆیەوە گوتی: «ئەو شتەی دەبێتە هۆی نیگەرانیی من...» ڕاستەوخۆ بە تووڕەیییەوە چاوی بڕیبوە چاوەکانی من.

«ئەو شتەی دەبێتە هۆی نیگەرانیی من ئەوەیە، مرۆڤێکی وەك تۆ دەتوانیٚ ئاوا بە دڵنیاییەوە لە بوونەوەرێك بدویٚ کە لە هەناوی تاریکی دا پیاسە دەکات.

-«هەر کەس لە هەوڵی ئەوە دایە ڕۆحی خۆی ڕزگار بکات. دوکتۆر، فەرقەکە لەوە دایە.

ئەو کاتە هەر بەوەی لە دڵم دا بوو ڕازی نەبووم و بۆیە بێپەردە و بەڕاشکاوی پێم گوت: «تۆ گوێت لە دەنگی ئەو نابیٚ، لەبەر ئەوەی بڕوات پێی نییە و کافری.

ئەویش زۆر بەشێنەیی و لە سەرەخۆ وەلامی دامەوە و گوتی: «بڕوات هەبیٚ سەرهەنگ، من کافر نیم، من ئەوەندەی باوەڕم بە بوونی ئەو هەیە، هەر ئەوەندە دەشڵەژێم کە بیر لەوە دەکەمەوە ئەو بوونی نەبیٚ، هەر لەبەر ئەوەیشە، هاتوومەتە سەر ئەو باوەڕەی کە باشتر ئەوەیە هەر بیریشی لیٚ نەکەمەوە و خۆمی پێوە ماندوو نەکەم.

نازانم چۆن بوو کە سەتم کرد، ئەوە ڕاست ئەو پرسیارەیە کە دەیەویست بمداتەوە. بیرم لەو شتانە دەکردەوە کە بیٚ ئەوەی بیەویٚ و خۆی بزانیٚ

درکانـدبوونی، هـەر وەك ئـەوەی لـە ڕووی کتێبێکـەوە خوێندبێتییـەوە.
ڕەوتـی خـاو و نـەرمونیانی شـەو، بـەردەوام دەروونـی ختیلکـە دەدام و
سەرخۆشی دەکردم.
لەو لای لاجامەکانەوە، باخچەیەکی چکۆڵەی لێ بوو، ئادێلایدا و کچـەکەم
چاندبوویان و پێی ڕادەگەییشتن. بە هۆی مانـدوو بـوون و پێڕاگەییشـتنی
ئەوانـەوە، ئـەو ئەکلیلـە چـیاییانە سـوور هەڵگـەڕابوون لـە دوورەوە
دەبریسکانەوە. هەموو بەیانییەك ئەوان بە دەوروپشتیاندا دەهاتن، هـەتا
لەم جۆرە شەوانەدا هالاوی گەرم لە نێو ماڵەکەدا بلاو بکەنەوە و ئارامی و
سـوکناییمان پـێ ببەخشـن و لـە کـاتی نووسـتندا بمـان لاوێننـەوە.
یاسەمەنەکەیش بەردەوام عەتری لە ولات دەپرژاند و لە بۆنـە خۆشـەکەی
درێغی لێ نەدەکردین. لە بەر ئەوەی ئەو یاسەمەنەکە هاوتەمەنی ئیزابێـل
بوو، بۆنە خۆشەکەی بەردەوام یادی دایکی بۆ زینـدوو دەکردینـەوە، نێـو
گژوگیاکانی حەوشەکە پڕ بوون لە سیسرکە، لەبەر ئەوەی دوای بـارانبڕان
کەمتەرخەمییان کردبوو گژوگیا زیادییەکانمان بـژار نـەکردبوو. تـەنیا ئـەو
شتەی بوونەکەی سیحراوی و جێی باوەڕ نەبوو... بوونی ئەو بوو، ئەویش
لەوێ بەو دەسرە دەستە گـەورە بـێ بایەخەیـەی ئارەقـەی نێـو چـاوانی
دەسڕی و لەبەر ئارەقە بریقەی دەداوە، پاشـان کـەمێك وەسـتا و گـوتی:
«سەرهەنگ، پێم خۆشە بزانم چۆن بوو ئەو پرسیارەت لێ کردم. ؟
گوتم: «هەر وا لە ناکـاو بـە مێشـکم دا هـات، لەوانەیـە دوای حـەوت سـاڵ
ویستبێتم بزانم بیر و ڕای مرۆڤێکی وەکو تۆ لەو بابەتەوە چییە.» بە دەم

سڕینی ئارەقەی نێو چاوانمەوە گوتم. «لەوانەیە هەندێکیش دڵنیگەرانی تەنیایی و بێ کەسییەکەت بووبێتم!

چاوەڕوانی وەڵامێك بووم، نەی دامەوە، کزومات بەرەو ڕووم ڕاوەستابوو، فیکرم لە هەموو شتەکانی ماکاندۆ دەکردەوە، لە مرۆڤە سەرشێتەکانی، ئەو پارانەی لە جەژنەکاندا بە فیڕۆیان دەدا. لە تۆفانی گەڵاکەی، لە چارەنووسە نادیارەکەی، کە دەستی بە سەر هەموو شتێك داگرتبوو، لە نێو زەلکاوی غەریزە و کەمتەرخەمیی خۆی دا باڵەپڕژێی دەکرد و ژیانی داهاتووی، لە عەترە هەرزان باییەکەی و پێڵاوە کۆن و بۆیاخکراوەکەی و ئەو دەنگۆیانەی وەك سێبەر. دایمە بە شوێنییەوە بوون و ئەویش خۆی لێ کەڕ کردبوو، گوتم: «دوکتۆر هیچ کاتێك بیرت لە ژنهێنان کردۆتەوە؟ بەر لەوەی پرسیارەکەم بگاتە کۆتایی، بۆ ئەوەی خۆی لە وەڵامی پرسیارەکەم بدزێتەوە، وەڵامی دامەوە. «تۆ زۆرت ئەو کچەی خۆت خۆش دەوێ، وا نییە سەرهەنگ؟

لە وەڵامی دا گوتم: «ئەوە شتێکی سروشتییە.» لە درێژەی قسەکانی دا گوتی: «زۆر باشە، بەڵام تۆ لەگەڵ هەموو کەسێکدا جیاوازیت هەیە.» هیچ کەسێك بە ئەندازەی تۆ پێی خۆش نییە بە کاروباری ماڵێوە خەریك بێ، تۆم بە چاوی خۆم دیتوە خەریکی چاککردنەوەی لاو لاوەی دەرگاکە بووی، ئەمە لە حاڵێکدا بوە لە ماڵەکەت دا چەند کەسێك کار دەکەن و ئەوان بە ئاسانی دەیانتوانی ئەو ئەرکە ڕاپەڕێنن. تۆ ئەو کارانەت پێ خۆشە، من پێم وایە تۆ ئەو کاتە خۆشحاڵی، کە کەرەستەی نۆژەنکردنەوەت پێ بێ و بە نێو ماڵێدا بگەڕێت و شتێك پەیدا بکەی بۆ

چاککردنەوە، تەنانەت لە تۆ بە دوور نییە سوپاسی کەسێك بکەیت لاولاوەی دەرگایەکی شکاندوە سەرهەنگ، لە بەر ئەوەیش سوپاسی دەکەیت کە هەلێکی بۆ ڕەخساندووی هەتا بە ئاواتت بگەیت. لە وەڵامی ئەو دا گوتم: «ئەوەیش بۆ خۆی خوویەکە.»

لەو کاتەدا دامابووم و نەم دەزانی چ وەڵامێکم دەداتەوە گوتم: «دەڵێن دایکیشم وا بوە، ئەو کارەم لەو دەچێ.»

ئەو قسەم شوێنی لە سەر دانا، شێوەی قسەکردنەکەی لە سەرەخۆ، بەڵام لاسارانە بوو، گوتی: «بەڵێ. عادەتێکی چاکە و بێجگە لەوەیش ئاسانترین ڕێگایە بۆ بە ئارامی گەییشتن، هەر لەبەر ئەوەیە ماڵێکی ئاوا ڕێکوپێکت هەیە و توانیوتە کچەکەیشت بە دڵی خۆت بار بێنی، دەمەوێ و پێم خۆشە ئەوەت پێ بڵێم، بە لامەوە زۆر گرینگە مرۆڤ کچێکی وەك ئەو کچەی تۆی هەبێ.

من هەر نەم زانی ئەو هەموو خۆدزینەوە لە باسەکە چ سوودێکی بۆ ئەو هەیە، بەڵام بەو حاڵەیشەوە لێم پرسی: «تۆ چی دوکتۆر؟ هیچ کاتێك بیرت لەوە کردۆتەوە چەندە پاش دەبوو ئەگەر تۆیش کچێکت هەبوایە؟

گوتی: «من، هیچ کاتێك بیرم لەو شتانە نەکردۆتەوە، سەرهەنگ.

بزەیەك گرتی و پاشان گەڕایەوە دۆخەکەی خۆی و گوتی: «لەبەر ئەوەی دڵنیام هیچ کاتێك منداڵەکانی من، وەك منداڵەکانی تۆ لە کار دەر نەدەهاتن.»

بێ گومان ئەوەی ئەو دەیگوت لە ناخی دڵییەوە دەهاتە دەرێ، هەر ئەوەیش ترس و دڵەکوتێی دەخستە هەناومەوە، لەو کاتەدا بیرم لەوە

دەکردەوە زیاتر لە هەموو لایەنێکی، مرۆڤ دەبێ بەزەییی بەو لایەنەی ژیانی دا بێت، هەستم کرد زۆری پێویستە گرینگیی پێ بدرێت، لە بەر ئەو هۆیەیش لێم پرسی: «هیچت لە بابەت توڵەوە بیستوە؟
گوتی: «نا
–«توڵە تەنیا قەشەی ئەم شارۆچکەیەیە، بەلآم لەوە گرینگتر ئەوەیە، ئەو کابرایە لەگەڵ گەورە، گەورەیە و لەگەڵ چکۆڵە، چکۆلەیە، هەموو هەست بە هاوڕێیەتی دەکەن و خۆشیان دەوێ. دەبێ تۆیش هەوڵ بدەی خۆتی لێ نزیك کەیتەوە.
–«ئەها، زۆر چاکە... ئەویش مندالّی هەیە؟
–«ئێستا بیر لەو شتانە ناکەمەوە، خەڵکی لە پاشملە زۆری باس دەکەن و دەنگۆ بۆ توڵە ساز دەکەن، لە بەر ئەوەی یەکجار زۆر و لە ڕادەبەدەر خۆشیان دەوێ و هۆگری بوون، بەلآم ئەوەی زۆر جێی سەرنجە دوکتۆر ئەوەیە، توڵە مرۆڤێکی زۆر ئاساییە و دوورە لە دینفرۆشی و مەراییکردن و خۆبەپیرۆززانین، ئەو بە تەواوی مانا مرۆڤە و ئەرکە مرۆڤایەتییەکانی خۆی زۆر بە باشی بە ڕێوە دەبات.
بە سەرنجەوە گوێی بۆ قسەکانم ڕاداشتبوو، مات و بێدەنگ، بە تەواوی دڵی لە لای من بوو، چاوە زەرد و بێبەزەیییەکانی بڕیبوە من و گوتی: «زۆر چاکە، دەی چی تریش؟
گوتم: «پێم وایە ڕۆژێك توڵە دەبێتە شێخێکی تەواو کەماڵ.
ئەو قسەیەم لە ناخی دلّمەوە هاتە دەرێ و تەواو باوەڕم پێی بوو «بە ڕاستی لە ماکاندۆدا مرۆڤێکی وەك ئەوت دەست نەدەکەوت. لە

سەرەتاوە هیچ کەسێك باوەڕی پێی نەبوو، چونکە خەڵکی ئێرە نەبوو، زۆر کەسیش لە مرۆڤە بە تەمەنەکان لە بیریان بوو بە منداڵی وەك هەموو منداڵەکانی تر ڕاوی پەلەوەرەکانی کردبوو، لە شەڕیشدا بەشدار ببوو، گەییشتبوە پلەی سەرهەنگیش... ئەوە باسەکەی زیاتر ئاڵۆز دەکرد، بۆ خۆت خەڵکی باشتر دەناسی، نە ڕێز لە ئەوانە دەگرن، کە پێشترسەرباز بوون و نە لە قەشەکانیش. بێجگە لەوەیش، کەس تا ئەو کاتە نەی دیتبوو قەشەیەك بێت و بێ جێگە لە دەقی ئینجیل بچێت ڕۆژژمێری نجوومی بریستۆل بخوێنێتەوە.

بزەیەکی هاتێ... ئەو کارەی هەر وەك ڕۆژە سەرەتاییەکان بە لای منەوە جێی سەرسووڕمان بوو، بە لای ئەویشەوە شتێکی نوێ بوو، هەر بۆیە گوتی: «شتێکی زۆر سەیر و سەمەرەیە، وا نییە؟

_«بە گشتی تولە مرۆڤێکی سەیرە، ئەو زیاتر پێی خۆشە لە بابەت دیاردەی کەشوهەوادا بدوێ. بە دایمە بیر لەو تۆفانانە دەکاتەوە کە کاکڵ و ناوەڕۆکی دینییان هەیە و هەموو یەکشەممانەیەکیش لە بابەت ئەوانەوە دەدوێ، هەر لە بەر ئەوەیشە وتارەکانی لە ڕووی دەقی ئینجیلەوە نین، بەڵکوو بە پێی ئەو زانیارییانەن لە کەشناسیی ڕۆژژمێری ئەستێرەناسی برستێول دا هاتوە.

پێکەنین ڕووخساری گەشاندەوە، بە گەرمی دڵی دابوە قسەکانم، منیش چەنەم گەرم داهاتبوو، بەو هۆیەوە درێژەم بە قسەکانم دا و لە سەری ڕۆیشتم. «دوکتۆر، شتێکی گرینگیش هەیە، کە بە لای تۆوە جێی سەرنجە، دەزانی ئەو لە کەنگێوە هاتوەتە ماکاندۆ؟

گوتی: «نازانم.

گوتم: «به ڕێ کەوت هەر ڕاست ئەو ڕۆژەی تۆ هاتییە ماکاندۆوە، ئەویش هاتە ئێرە. سەیرتریش لەوە ئەوەیە ئەگەر تۆ برایەکی گەورەترت لە خۆت هەبوایە، بە دڵنیاییەوە دەڵێم لە قەڵافەت و ڕواڵەتدا ڕاست لە تولە دەچوو.

وا وێ دەچوو بیر لە هیچ شتێك ناکاتەوە، لە ڕواڵەت و هەڵسوکەوتی دا هەستم کرد وەختی ئەوە هاتوە ئەو شتەی لە دەروونم دایە بە ڕاشکاوی پێی بڵێم، هەر کە زانیم هەلەکە لە بارە بۆ گوتن، ڕووم تێ کرد و گوتم: «دوکتۆر، سەردانێکی تۆلە بکە هەتا بزانی و بۆت ڕوون بێتەوە، وەك تۆ بیری لێ دەکەیتەوە وایش نییە.

ئەو لە وەڵامم دا گوتی: زۆر چاکە سەردانی تولەیش دەکەم.



بەرە بەرە بە تێپەڕینی زەمان لە بێدەنگی و ئارامی دا قوفڵەکە ژەنگی هەڵ دەهێنا. کاتێك ئادێلایدا زانیی دوکتۆر ڕۆیشتوە و لەگەڵ میمیّ بە یەکەوە دەژین، ئەو قوفڵەی لە دەرگاکەدا، خێزانم ڕۆیشتنەکەی ئەوانی بە سەرکەوتنێك بۆ خۆی لە قەڵەم دەدا. لەو ڕۆژەوە بڕیارم دا دوکتۆر لە ماڵی ئێمەدا بژی، خێزانم بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوو بە شێوەیەك وەدەری بنێ، ئەوە بەرهەمی ئەو هەوڵە بێوچانە بوو کە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بە گەرمی هەوڵی بۆ دابوو.

ئەوە حەڤدە ساڵە ئەو قوفڵە پارێزگاری لەو دەرگایە دەکات.

ئەوە ماوەی هەشت ساڵە هیچ گۆڕانێك بە سەر ڕوانگە و بیر و زەینی مندا نەهاتوە، ئەو شتەی لە نیگای خەڵکییەوە ناڕەوایە و لە ڕوانگەی خوداوە پێزانین و ئەمەکناسییە، لەوانەیە کە ئازاردانی من چەند ساڵ بەر لە مردنم دەستی پێ کردوە، چارەنووسم وایە هەر لە ژیانم دا تاوانی گوناحەکانم بدەمەوە.

ژەنگەکە هێشتا قوفڵەکەی بەتەواوی نەتەنیبووەوە کە مارتین بە دڵێکی لێوڕێژ لە عەشق و خۆشەویستی و بە هیوای زەماوەندکردن لەگەڵ کچەکەم دا و بە چەمدانێك پڕ لە گەلاڵەی جوان و توێژینەوەی نوێوە لێمان وە ژوور کەوت.

ڕاستودروستبوونی ئەو گەلاڵانە ئێستایش بە لای منەوە ڕوون نین، ئەو بە خۆی و کۆتێکی چواردوگمەوە، پێی نایە نێو ماڵەکەی منەوە، ئەوەندە سەروڕوو خۆش و شاد و جوانچاك بوو، سەرنجی هەموو کەسێکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا و تەواو سەرسامی خۆی دەکردن. یازدە ساڵ لەمەو پێش لەگەڵ ئیزابێل زەماوەندی کرد و نۆ ساڵیشە بە جانتایەك پڕ لە قەبزی وازۆکراوی منەوە ڕۆیشتوە و بەڵێنی پێ دام هەر کاتێك کاری ئەو مامەڵەی پارەکەی لە ئەستۆی من بوو، کۆتایی پێ هات بگەڕێتەوە، بەڵام من ئەو مافە بە خۆم ڕەوا نابینم بڵێم لەبەر ئەو کارانەی، مرۆڤێکی دووڕوو هۆقەباز بوە، ماف ئەوەم نییە پێم وا بێ ئەم زەماوەندە تەنیا بەهانەیەك بوە بۆ ئەوەی هەتا من باوەڕی پێ بکەم، بەڵام ئەو هەشت ساڵە تاقیکردنەوەیەکی زۆر باش و دەسکەوتێکی زۆر گرینگی بۆ من هەبوو. لەوانە بوو مارتین ببێتە خاوەنی ئەو وەتاغە، ئادێلایدا ناڕازی بوو لە سەر قسەکەی خۆیشی زۆر سوور و پێداگر بوو، دەمزانی خێزانم بە دڵ و گیانەوە پێی خۆش بوو تەویلەکەیان بۆ خاوێن بکاتەوە بچنە ئەوێ، نەك ئەو بووك و زاوایە بچنە ئەو وەتاغە چکۆڵەیەوە. بێ سێودوو کردن بۆچوونەکەیم قەبووڵ کرد، ئەو کارەم

سەرکەوتنەکەی ئەوی مسۆگەر کرد: ئەو سەرکەوتنەی هەشت ساڵ پاش کەوتبوو.

ئەگەر هەر دووکمان بە هەڵە باوەڕمان بە مارتین کرد، ئەوە هەڵەیەکی هاوبەش بوو، بەو حاڵەیشەوە، ئەوەی لە پاشان ڕووی دا بە لامانەوە سەخت و تاقەتپڕووکێن بوو، وەك دیاردەی کەشناسی وەختێك ڕۆژژمێرەکە بە جوانی پێشبینیی دەکرد.

کاتێك بە مێمێم گوت بچێتە دەرێ و کوێی پێ باشە ڕوو بکاتە ئەوێ و دوای ئەوەی هاوسەرەکەم پێی گوتم تۆ لاواز و ترسەنۆك و دەستەوەستانی، توانیم بە خۆم دا بێمەوە و بۆچوونەکانی خۆم بە سەر هەموو شتێکدا بسەپێنم، لە هەموو کارەکاندا، وەك خۆم دەمەویست و پێم خۆش بوو وام کرد، بەلاّم هێزێك لە دەروونمەوە هاواری دەکرد، کە لە بەرانبەر ڕووداوەکاندا لاواز و دەستە وەستانم و هیچم لە دەست نایە.

ئەوە من نیم لە ماڵەکەی خۆم دا هەموو شتێکم لە بەر دەست دایە و بە سەر هەموو لایەکدا زاڵم. بەڵکوو هێزێکی ئەفسووناوی و نادیارە، هێزێکە بەردەوام ڕەوتی ژیانمانی لە بەر دەست دایە و ئێمە لە ئاستی ئەودا کەرەستەگەلێکی بێ بایەخین.

من لە سەر ئەو باوەڕەم، هەموو شتەکان لە هێزێکی نەپساوەی غەیبزانی سروشتەوە فەرمان وەردەگرن. لەوەی مێمێ توانیی ئەو دووکانە بکاتەوە (ئەوە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کاتێك کلّفەتێك ببێتە گراوی دوکتۆری گوندێك، درەنگ یان زوو ناچار دەبێ دووکان دابنێت.) تێگەییشتم دوکتۆر لەو ماوەی لە ماڵی ئێمە دابوە پووڵێکی بۆ خۆی

پاشـەکەوت کـردوە و بـە دزیـی ئێمـەوە پوولـەکانی لـە دەخیلەیەکـدا هەڵگرتوە. ئەو پوولانەی پاشەکەوتی کردبوو، ئەو هەقدەستانە بـوو، کـە لە نەخۆشەکانی وەرگرتبوو.

کاتێك مێمیٚ دووکانەکەی دانا، هەموو پێیان وا بوو کە دوکتۆریش لەوێیـە و بە هۆی ئەو دەنگۆیانەی تەنیا خودا بۆ خۆی لێیان ئاگادارە، لـە پشـت دووکانەکەوە دەرگای لـە خـۆی داخسـتوە، دەیـانگوت لێـو لـە خـواردنی دەریٚ نادا و لە حەسارکەی باخچەیەکی بۆ خۆی ساز کردوە.

لە سەرەتاوە مێمیٚ جارجـارە کوتـە گۆشـتێکی بـۆ خـۆی دەکـڕی، بـەڵام پـاش سـاڵێك ئـەویش خـواردنی گۆشـتی وەلا نـا و لەوانەیـە ئـەو پیـاوە ئەویشی فێـرە گیـاخۆری کردبێـت، پاشـان دووبـەدوو دەرگایـان لـە سـەر خۆیان گاڵە دا، هەتا ئەو کاتەی بەرپرسـان چـوون دەرگاکـەیان شـکاند و ماڵەکەیان پشکنی و باخچەکەیان بۆ دیتنەوەی تەرمی مێمیٚ هەڵکۆڵی.

خەڵکی پێیان وابوو دەرگای لە سەر خـۆی داخسـتوە و لـە نێـو هەڵۆرکـە شەقوشڕەکەی دا نووستوە و شانەوشانی بۆ دەکات، بـەڵام مـن دەمزانـی تا سەر ناتوانیٚ خۆی لە خەڵك و خودا بدزێتەوە، ئەم بیانوانەی زووتـر لـە کاتی مردنـی کۆتـاییی پـیٚ دیٚ. دەمزانـی درەنـگ یـان زوو ئەمـە ئاشـکرا دەبیٚ. لە بەر ئەوەی هیچ مرۆڤێك ناتوانیٚ خۆی تەریك خاتەوە و بە تەنیا بـژی و خـودا لـە بـیر بەرێتـەوە. ئەگـەر لـە مـاڵێش نەیەتـە دەریٚ و هـیچ کەسـێکیش باسـی ئـازاری قـەبر و ئـاوری دۆزەخ و مـاری حەوتسـەر و هەڵکۆڵینی چاو و بڕینی زمانی بۆ نەکات.

دوو سێ ساڵ بەر لە مردنەکەی، ئەو کاتەی تازە گەیشتبووە ئێرە، من ئەو ڕاستییەم دەزانی، لەو شەوەوە بە یەکەوە لە بەر هەیوانەکە قسەمان کرد و دوای ئەویش، ئەو کاتەی ئەوم بۆ دیتنی مێمێ بەردە وەتاغە چکۆڵەکەوە، تۆ بڵێی توانای ئەوەم بووبێ نەهێڵم و بەر بە زەماوەندەکەیان بگرم و ببمە لەمپەر لە نێوان ئەو و مێمێدا؟ لەوانە بوو پێشتر بمتوانیبایە ئەو کارە بکەم، بەڵام ئێستا کار لە کار ترازاوە، لە بەر ئەوەی سێ مانگ پێشتر لاپەڕەیەکی تر لە چارەنووسی ژیانیان هەڵدرابووەوە، دەبوو کارەکە بگاتە کۆتایی.
ئەو شەوە لە نێو هەلۆرکەکەی دا نەبوو... شەکەت لە سەر گازەرای پشت لە سەر تەختە سەفەرییەکەی ڕاکشابوو، سەری بە پشتدا خستبوو و چاوی بڕیبووە بن میچەکە، کە شەوقی مۆمەکە ڕووناکی کردبوو، وەتاغەکەی گڵۆپی کارەبای تێدا بوو، بەڵام هیچ کاتێك هەڵی نەدەکرد، پێی خۆش بوو لە تاریکیدا ڕابکشێ و چاو لە لێڵایی ببڕێت. کاتێك چوومە نێو وەتاغەکەیەوە، جووڵەی نەکرد، هەر کە چوومە ئەو دیوی دەرگاکەوە هەستی کرد کەسێکی تریش لە ژوورەکەدایە و تەنیا نییە، ئەو کاتە گوتم: «دوکتۆر، ئەگەر نابێتە زەحمەت چاوێك لەو کچە سوورپێستە بکە، زۆر ناساغە.» هەستا و لە سەر تەختەکەی دانیشت، کە زانی من چوومەتە ژوورەوە، بێ شك هەستی بە شتێك کردبوو، تەواو شڵەژا و تێك چوو، دەستێکی بە سەروقژیدا هێنا و لە سەر لێواری تەختەکەی دانیشت... چاوەڕوان مایەوە، گوتم: «دوکتۆر، ئادێلایدا کاری پێتە، دەڵێ بێ چاوێك لە مێمێ بکات.

له سەر لێواری تەختەکەی دانیشت، برێك مات بوو، وەڵامەکەی تەواو تاساندمی.

-«پێویست به نیگەرانی ناکات، شتێکی وا نییه... دوو گیانه.

پاشان سەری لێم هێنا پێشەوه، وەك ئەوەی پشکنین بۆ من بکات گوتی: «چەند ساڵه لەگەڵ من له سەر جێیەك له باخەڵی مندا دەنویٚ.

قسەکەی ئەوەندە بە پەلە و لەناکاو و چاوەڕوان نەکراو بوو، تەواو تاسام، نه هەستم به تووڕەیی کرد و نه تووشی سەرسووڕمان بووم، هەر هیچ هەستێکم نەبوو، ئەو بەڕاشکاوی لێفەی له سەر هەتیوان هەڵدایەوه و دانی بە هەموو شتێك دانا، ئەو کارە لەگەڵ ڕوانگەی مندا بۆ ژیان جیاوازییەکی زۆری هەبوو، لەگەڵ هەستی مندا نەدەگونجان و یەکیان نەدەگرتەوه. له جێی خۆم وشك بووم و ڕەق ڕاوەستام، هۆیەکەیشیم نەدەزانی چییه. پاش ماوەیەك بێدەنگی، چاوەڕوان بوو بزانێ من چی دەڵێم، دڵنیا بووم ڕاست دەکات، زانیم کار له کار ترازاوه و تازه ناکرێ له بەری هەڵبێم و خۆی لێ هەڵەکەم.

-«ئەگەر وایه دەزانی ئێستا له چ هەلومەرجێك دای دوکتۆر.

هەر ئەوەندەم گوت و بێدەنگیم لێ کرد، گوتی: «مرۆڤ خاوەنی هەزرە سەرهەنگ، کاتێك دەست بۆ کارێکی بقڤه دەبات، دەزانێ چ ڕێگایەکی گرتۆته بەر و خەریکە چ کارێك دەکات و ئاکامەکەیشی لە بەر چاوه، ئەگەر هەڵەیەکیش بێتە پێشێ هۆکارەکەی ئەوەیه بەوردی بیری لە شتەکه نەکردۆتەوه و هەموو لایەنەکانی بە جوانی هەڵ نەسەنگاندوه، دیاره هەموو شتێکیش له توانای مرۆڤ دا نییه.

ئەو شێوە خۆدزینانەوەی بۆ من شتێکی نامۆ نەبوو، بەڵام وەك هەمیشە نەم دەزانی بەرەو کوێم بە کێش دەکات، کورسییەکم هێنا و بەرانبەری دانیشتم. پاشان لە جێی خۆی هەستا و گیرەی قایشی شەڵوارەکەی داخست و شەڵوارەکەی هەڵکێشا و ڕێکوپێکی کرد، لەو بەری وەتاغەکەوە گوتی: «دڵنیام زۆرم خۆپاراستوە، دڵنیایشم ئەوە دووهەمین کەڕەتیەتیێ، جاری ئەوەڵ ئێوە هەر نەیشتان زانی و هەستیشتان پیێ نەکرد!

گەڕایەوە بۆ لای تەختەکەی و بێ ترس و دڵەکوتێ درێژەی بە قسەکانی دا. لە تاریکییەکەدا دەنگی هەنگاوە لە سەرەخۆکانیم لە سەر بەرد مەڕمەڕەکە دەبیست. گوتی: «کەڕەتی یەکەم بۆ هەموو کارێك ئامادە بوو، بەڵام ئێستا ڕازی نییە.

دوو مانگ لەمەو بەر پێی گوتم، دیسان دووگیانە، هەر ڕستەکەی کەڕەتی یەکەمم پێم گوتەوە، ئەمشەو هەر ئەو کارەی جاری یەکەم دووبارە دەکەینەوە... لە وەڵامم دا گوتی: «ئەوڕۆکە ناتوانم و بەیانی دێم، کاتێك بۆ خواردنەوەی قاوە چوومە چێشتخانەکە پێم گوت چاوەڕێتم. لە وەڵامم دا گوتی: «نایەم و چاوەڕوانم مەبە.

گەییشتەوە لای تەختەکەی، بەڵام دا نەنیشت، پشتی کردە من و سەر لە نوێ دەستی کردەوە بە قەدەملێدان، گوێم لە دەنگی بوو، لەسەرەخۆ دەدوا، بە دڵنیایی و پشتئەستوورییەوە قسەی دەکرد. دەمزانی پەڕینە نێو قسەکانی کارێکی چەتوونە، کاری من تەنیا گوێڕاگرتن بوو. بەردەوام قسەی دەکرد: «بەڵام پاش دوو ڕۆژ سەر لە

نویَ هاتەوە، تەواوی پێداویستییەکانم ساز کردبوو، گوتم: دابنیشە و بەرەو مێزەکە چووم هەتا ئاوخۆرییەکە بێنم، پاشان کاتێك پێم گوت بیخۆوە، تێگەییشتم ئەم جاریان وەك کەڕەتەکەی تر نییە و تەواو گۆڕاوە. بە ڕوویەکی تاڵەوە چاوێکی لێ کردم و بەتووڕەییەوە گوتی: «نامەویَ هەر وا سووکوئاسان ئەم جارە دەست لە ئەمەیان هەڵ بگرم، دوکتۆر... دەمەویَ ئەمەیان بۆ خۆم بیَ و هەر خۆیشم گەورەی بکەم.

هەر کە دیتم ئاوا بەئاسانی لە شتەکە دەڕوانیَ لەوانە بوو دەهەری بم و ئاورم تیَ بەر بیَ، گوتم: «دوکتۆر، بەم قسانەت پاساو بۆ ئەو کارە ناحەزەت مەهێنەوە... ئەو کارەی تۆ لە دوو لایەنەوە ناحەز و نەشیاوە، یەکەم لەبەر ئەوەی ئەو کارە لە ماڵی ئێمەدا ڕووی داوە و دووهەم لە بابەت لەباربردن و هەڵکەندنی ئەو منداڵەوە.

_«بەڵام من هەر کارێکی لە دەستم دەهات دریغیم نەکرد. سەرهەنگ... پاشان هەستم کرد ئیتر هیچم لە دەست نایە، ئەوە بوو بڕیارم دا هەموو شتێکیت پیَ بڵێم.

–«ئەگەر بە ڕاستی دەتەویَ ئاسەواری ئەو بێڕێزییە بە تەواوی بسڕێتەوە، پێم وایە خۆت باش دەزانی تەنیا ڕێگایەکت بۆ دەرباز بوون لەو گێژاوە هەیە، تۆ مرۆڤێکی دونیادیدەیت و دابونەریتی ماڵی ئێمەیش چاك دەزانی چۆنە.

ئەویش لە وەڵامم دا گوتی: «من بە هیچ شێوەیەك پێم خۆش نییە ببمە هۆی ئازاری ئێوە سەرهەنگ. باوەڕم پیَ بکە... خەریك بوو پێت بڵێم،

دەمەویێ دەستی ئەو ژنە سوورپێستە بگرم و بیبەمە ئەو ماڵە چۆڵەی سەر کۆلاّنەکە و لە گەڵیدا بژیم.

لێم پرسی: «لەگەڵ ئەودا دوکتۆر؟!... ئاوا بە ئاشکرا لەبەر چاوی ئەو خەڵکە؟... دەزانی بەو کارەت ئابڕوو و حەیای چەند ساڵەی ئێمە دەچیێ؟ تەواوی عالەم بەردمان لێ هەڵدەگێڕێتەوە!»

پاشان گەڕایەوە و بۆ لای کورسییەکە و دانیشت، سەری داخست و ئەنیشکی نایە سەر ئەژنۆکانی و درێژەی بە قسەکانی دا. لە سەرەتاوە زۆر بە ساردی قسەی دەکرد، پاشان وەك حوشتری نێر گەرم داگیرسا و بە توندی درێژەی دایە و گوتی: «کارێکی وا دەکەم دەردی سەری بۆ تۆ ساز نەبێ، سەرهەنگ، شتێکی تری کە زۆر گرینگە و پێویستە بیزانی ئەوەیە، دڵنیا بە ئەو منداڵە لە من نییە!»

-«ئاخر دوای ئەوەی مێمیێ دەڵێ لە تۆیە!

وردەوردە خەریك بوو وەك شیر هەڵدەچووم. ڕێگایەکی ناحەزی بۆ پاساوهێنانەوە هەڵبژاردبوو. قەرەچینۆینێکی ساز کردبوو مەپرسە، من نەم دەتوانی هەر وا سووکوئاسان کارەکەی پشت گویێ بخەم و خۆی لێ لا بدەم، بەلاّم ئەو بە تووڕەیییەوە گوتی: «کاتێك من دەڵێم مێمیێ ڕازی نابێ دەبێ تۆیش باوەڕم پێ بکەی. وەختایەك دەڵێم دەستی دەگرم و لەگەڵ خۆم دەیبەم و دەچینە ئەو ماڵەوە، دڵنیا بە ئەو کارە دەکەم، تەنیا لەبەر ئەوەی سەر ئێشە بۆ ئێوە ساز نەکەم، هەر لە بەر ئەوەیە هیچی تر.

ئەوەندە بە دڵنیاییەوە دەیگوت مێمێ ڕازی نابێ ئەو منداڵە لەوە، تەواو دەهری ببووم و لە دین چووبوومە دەرێ، هەستم کرد ئەم پیاوە دەبێ خاوەن هێزێکی نادیار و شاراوەی بێئامان بێ، پێم گوت: «ئێمە تا ئێستا لە بەینی مێمێ و کچەکەی خۆمان دا هیچ فەرقێکمان دا نەناوە، هەر بۆیە دڵنیام ئەو بە خاتری تۆ دڵی ئێمە نائێشێنێت.

-«ئەگەر ئەو شتانەی من دەیانزانم تۆیش بتزانیبایە، هەرگیز ئەو قسانەت بە زار دانەهات. سەرهەنگ! .. داوای لێبووردنت لێ دەکەم، کە ئاوا بە ڕاشکاوی و بێپەردە لەگەڵت دەدوێم. ئەگەر ئەو کچە سوورپێستە لەگەڵ کچەکەی خۆتان وەك یەکتری چاو لێ بکەیت، دڵنیا بە بێڕێزێییەکی زۆر گەورەت بە کچەکەی خۆتان کردوە.

-«تۆ هیچ بەڵگەیەکت پێ نییە بۆ ئەو قسانەی دەیان کەیت؟

بە تووڕەییەوە وەڵامی دامەوە و گوتی: «هەمە، کاتێك دەڵێم ئەو ڕازی نابێ من بابی ئەو منداڵەم، بۆ ئەو قسەیەم بەڵگەم هەیە.

سەری خست و ئاخێکی هەڵکێشا و درێژەی دایە: «ئەگەر ئەو شەوانەی لە ماڵی دەچێتە دەرێ، شوێنی بکەوێ و بزانی بۆ کوێ دەچێ و هاموشۆی کوێ دەکات، تەنانەت داوا لە منیش ناکەی لەگەڵ خۆم دا بیبەم. لەو بابەتەوە ئەوە منم لەخۆبردوویی دەکەم و پیاوەتی و ئابڕووی خۆم دەخەمە مەترسییەوە. من بۆیە ئەو کارە پیاوانەیە دەکەم و ئەو کارە لە ئەستۆ دەگرم، هەتا تۆ تووشی دەردیسەری نەبی و ئابڕووت نەچێ.

لەو کاتەدا بیرم لەوە دەکردەوە ئەو و مێمێ هەر سەر ناکەن بە کڵێسایشدا، بەلام ئەوەی زۆر جێگای سەرنج بوو، دوای ئەوەی ئەو قسانەی کرد، ئیتر لە خۆم ڕا نەدی خۆ لە کارێکەوە هەڵقورتێنم، کە وەك بارێکی قورس و گران بە شانی ویژدانمەوە قورساییی دەکرد. هەلەکە تەواو لە بەرژەوەندیی ئەو دابوو، زانیم تازە ئەو سوار و من پیادە و نای گەمێ و دەستیم بۆ با نادرێ، هەر بۆیە ڕازی بووم و بەناچاری قسەکانیم سەلماند.

گوتم: «زوو چاکە دوکتۆر، هەر ئەمشەو کارێك دەکەم ئەو ماڵەتان بۆ ڕێکوپێك و خاوێن بکەنەوە، بەلام وا چاکە ئەوەیش بزانی من وە دەرت دەنێم و تۆ بە ویست و دڵخوازی خۆت لێرە نارۆیتە دەرەوە. سەرهەنگ ئورلیانۆ بۆئیندیا لەوەی تۆ وەلامی متمانەکەی بەو شێوەیە دەدەیتەوە بەلایەکت بە سەر دێنێ و بە توندترین شێوە تۆڵەکەت لێ دەکاتەوە.» کاتێك زانیم تەواو شڵەژاندوومە و لە ناخەوە هەڵم تەکاندوە، چاوەڕێ بووم چاوی بقووچێنێت و دەمی بکاتەوە و هەوسار لە هێزی ئەهریمەنی و شەڕەنگێزی دەروونی داماڵێ و ئەوەی بە سەر زاری دا دێ و ئەوەی ناحەزە پێمی بڵێ، بەلام دەستی کرد بە تاریفدان و بە بالآهەڵگوتنم دا و گوتی: «تۆ پیاوێکی زۆر بەڕێز و چاکی سەرهەنگ، هەموو کەسێك ئەوە دەزانێ، بێجگە لەوەیش، لە تەواوی ئەو ماوەیە لە ماڵی تۆدا ژیاوم، تەنانەت جارێکیش ڕووت لێ تاڵ نەکردووم و ناو چاوت لێ تێك نەناوم.

له جێی خۆی هەستا، لەوە نەدەچوو خۆی بە براوە بزانیَ و من بە دۆڕاو، لەبەر ئەوەی توانیبووی لە دڵەوە سوپاسی ئەو هەشت ساڵ میوانداریيەی ئێمە بکات و هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد.
ئەوە من بووم هەستم بە نیگەرانی دەکرد و ئەو شەوە نیشانەکانی مەرگم تێدا دیت، کە وردەوردە خەریك بوو لە نێو چاوەزەردەکانی دا چرۆی دەردەکرد. هەستم کرد زۆر ناحەز لەگەڵی دا جووڵاومەتەوە، دەبیَ هەتا ماوم تاوانی ئەو کارەم بدەمەوە، ئەو کەسەی ئێستا ویژدانی ئاسوودەیە و هەست بەئارامی دەکات ئەوە، نەك من.
گوتی: «بەڵام لە بابەت مێمێوە، پێیان بڵێ بە ئاڵکۆڵ لەشی بۆ داماڵن، چاکترە ئەوەیە هیچ دەرمانێك نەخوات!

بابە گەورەم گەڕایەوە بۆ لای دایکم، دایکم دانیشتبوو چوو بـوە مـاڵی فیکرەوە، کراس و کڵاوەکەی لە تەنیشـت خۆیـەوە لـە سـەر کورسـییەکە دانـابوو، بـەڵام دایکـم کـاری بـە سـەریانەوە نـەداوە. بابـە گـەورەم لێـی دەچـێتە پێشـەوە و هەسـت دەکـات دایکـم فیکـری لـە شـوێنێکی تـرە و گۆچانەکەی هەڵدێنی و لە بەر چاوی دا ڕای دەوەشێنێ و دەڵێ: «هەستە لە خەو.

دایکـم چـاوی دەتـروکێنێ و سـەری دەجووڵێنێتـەوە و بابەگـەورەم پێـی دەڵێ: «بیرت لە چی دەکردەوە؟

دایکیشم بە بزەیەکەوە دەڵێ: «لە فیکری تولەدا بووم.

بابەگەورەم سەر لە نوێ لە تەنیشتییەوە دادەنیشێت، چـەناگەی دەنێتـە سەر قەفی گۆچانەکەی و دەڵێ: «دڵمان لە یەکەوە نزیکە، منیش ڕاست لە فیکری ئەو دابووم.

ئەوان باش لە یەکتری حاڵین، بێ ئەوەی چاو لە یەك بکەن لەگەڵ یەکتری دا قسە دەکەن، دایکم پاڵ دەدا بە پشتی کورسییەکەوە، گرینگ ئەوەیـە

جوان لە یەکتری حاڵین. هەر وەک من و ئیبراهام، کاتێک بوو ئەوەی لووکرسیا ببینین، هەر بە ئاماژەیەکی چکۆلە جوان یەکتری حاڵی دەکەین.

بۆ ئەوەی بتوانین لووکرسیا ببینین، دەبێ پێنج شەش گەز بە نێو شوێنێکی پڕ لە گژوگیادا بڕۆین، دەبێ لە دیوارێکەوە بچینە ئەو دیو، سەر ئەو دیوارە هەمیشە پڕە لە مارمێلکەی سەوز و دایمە ئەو کوڕە قەڵەوە لە سەری دادەنیشت و بەو دەنگە ژنانەیەوە گۆرانیی دەگوت. ئیبراهام بە هەڵاتهەڵات بە بن تیشکە بلوورییەکەدا دەڕوات، پاشان ڕادەوەستێ، ئێستا گەییشتووینەتە پەنای پەنجەرەکە دەڵێم. «لووکرسیا.

بە ئەسپایی قسە دەکەم، دەڵێی لووکرسیا نووستوە، بەڵام بە خەبەرە، لە سەر تەختەکە دانیشتوە و پێڵاوی لە پێدا نییە و کراسێکی ئاودامێنی درێژی هەراوی سپیی خەتخەتی تایبەتی خەوی لە بەر دایە، کاتێک ئێمە قسە دەکەین، لووکرسیا چاوەکانی هەڵدێنێ و بە نێو دیوەکەی دا دەیگێڕێ و ئەو چاوە خڕانەی، کە هەر لە مەڕمەڕە شووشە دەچن لە ئێمە دەبڕێ، پاشان پێدەکەنێ و دەچێتە ناوەڕاستی وەتاغەکە، دەمی داچەقاندوە و ددانە چکۆڵە شکاوەکانی دەردەکەون.

سەرێکی خڕی هەیە، قژی پیاوانە کورت کردۆتەوە، هەڵدەتروشکێ و چاو لە دەرگاکە دەکات، هێورهێور سەر دەکەوێ و هەر لەو کاتەیشدا، بە ڕق و تووڕەیییەوە، من و ئیبراهام لە پەنجەرەکەوە چاوی لێ دەکەین. بە ترس و هەناسەبڕکێوە سەری هێنا پێشێ و چاوە خڕەکانی کە هەر لە

مەرمەڕ شووشـە دەچـوون زەق ببوونـەوە و دەبریسـکانەوە. جلوبـەرگی خەوەکـەی بـە سـەر خـۆی دا دەکێشـێ و لـە ناوەڕاسـتی وەتاغەکـەی دا دەخەوێت، لاقەکانی لە پەنای یەکترەوە ڕادەکێشێ و توند بە یەکیانـەوە دەنووسێنێ و لە پووزی بەرەو ژوور دەست دەکات بە لەرزین. لە ناکاو بە توندی ڕووی وەردەگێڕێ و هاوار و ناڵەیەك تەواوی ماڵەکە دادەگرێ و لـە هەموو لایەکەوە دەنگ دەداتەوە و بە ئەنگوستی ئاماژە بۆ ئێمە دەکـات، لەو کاتەدا دەرگاکـە دەکرێتـەوە و ژنەکـە بـە پەشـۆکاوی و شـڵەژاوییەوە دێتە ژووری: «بۆ ناڕۆن ملتان بشکێنن؟

چـەند ڕۆژێکـە نەچـووینەتە سـەردانی لووکرسـیا، ئێسـتا ئـەوە بـەرەو ڕووبارەکە بە ڕێوەین، دەکەوینە سـەر ڕێگاکـە و وردەوردە دەگەینـە نێـو مـەزراکان. دەبـێ بەپەلـە بـڕۆم، ئەگـەر لێـرە زوو تێپـەڕین، ئیبڕاهـام چاوەڕوانمە، بەڵام بابەگەورە و دایکم لە شوێنی خۆیان نـابزوون، چـاو لـە بابەگەورەم دەکەم... لە پشت شووشـەی چاویلکەکەیەوە لـە چـاوەکانی دەڕوانم، هەناسـەیەکی قـووڵ هەڵدەکێشـێ. جووڵەیـەك دەکـات و بـە ئەسپایی بە دایکم دەڵێ: «تەنانەت ئەگەر بە زەبری شـێلاقیش بـێ تۆڵـە ناچاریان دەکات بێن.» پاشان لە سەر کورسییەکە هەڵدەستێ و دەچێتە ژوور سەری مردوەکە.

٤

٤

ئەوە دووهەمین کەڕەتمە پێ دەنێمە نێو ئەم وەتاغەوە، لەگەڵ دە ساڵ لەمەوپێش هیچ گۆڕانێکی بە سەردا نەهاتوە و هەر وەك خۆی ماوەتەوە. لەو کاتەوە هەتا ئێستا کەس دەستی لە هیچ شتێکی ئێرە نەداوە. تاپۆو بەڵگەکان هەر لە جێی خۆیانن. مێزەکە، کورسییەکە، ئەو دووسێ جل و پۆشاکەی ئەو کات لێرە کەوتبوون ئێستایش هەر لە سەر جێگای خۆیانن و تەکانیان نەخواردوە، هەر دەڵێی دوێنێ بوو من و تولە هاتین بۆ ئێرە هەتا لەگەڵ کار بە دەستەکاندا ئاشتیان بکەینەوە.

کاتێك کۆمپانیای مۆز دەستی لە بەرۆك بەرداین و ماکاندۆی بەو هەموو زبڵ و زاڵەی لەگەڵ خۆی دا هێنابووی بۆ بە جێ هێشتین، تۆفانی گەلاَیش، دوا یادگاریی ڕۆژە خۆشەکانی ماکاندۆی ساڵی ۱۹۱۵ یش باری کرد و ڕۆیشت. گوندێکی وێرانە مایەوە و چوار دووکانی چکۆلەی پەڕپووت و تاریك، بە دایمە جمەیان دەهات لە مرۆڤی تووڕە و هەراسان و بێکارە و هەموویان وەك ئەو ئاغایەی ملك و ماڵێکی زۆری لە قیس چووبێ، یاد و بیرەوەریی ژیان و گوزەرانی ڕابردوویان تەواو ئازاری دەدان.

شەش مانگ بەر لە ئێستا، نامەیەکی بێ ناو و نیشان و بێ واژۆیان بە دەرگای ئەم ماڵەوە هەڵواسیبوو، کەس سەرنجی نەدایە و چاوی لێ نەکرد، هەتا باران وردەوردە هێڵە ڕەشەکانی شۆردەوە و با تووشەکانی کۆتاییی مانگی فێوریە، کاغەزەکەی لێ کردەوە و لەگەڵ خۆی دا ڕەپێچەکی دا و بردی و شوێنەواری ون کرد. لە کۆتاییەکانی ساڵی ۱۹۱۸ لە بەرەبەری هەڵبژاردندا، حکوومەت بۆ ئەوەی خەڵکی بەرەو

هەڵبژاردن هان بدات و بیان شڵەژێنێ، فیکرێکی کردەوە و کەسێك لەگەڵ بەرپرسانی تازەدا قسەی کرد و لە بابەت ئەو دوکتۆرە گۆشەگیرەوە گوتی، پاش ئەو چەند ساڵە بەڵگەیەکمان هەر دەست دەکەوێت هەتا بوونی ئەومان بۆ بسەلمێنێت.

بە ناچاری گوتیان چەند ساڵێك لەمەو بەر ژنێکی سوورپێست لەگەڵی دا دەژیا دووکانێکی دانابوو، خۆشی بە تەنیا بە ڕێوەی دەبرد و ژیانێکی تێروتەسەلیشی بوو، زۆربەی خاوەنکارە پووڵدارەکانی ئێرە بە ئاواتییەوە بوون، لە ناکاو ڕۆژێك دەرگای دووکانەکەی نەکرایەوە، ئیتر کەس نەی دیتەوە، خەڵکی پێیان وابوو مێمێ و دوکتۆر هێشتا هەر لەو ماڵەدا بە یەکەوە دەژین و خواردنی خۆشیان لەو سەوزییانەوە دابین دەکەن، کە لە باخچەکەی نێو حەوشەکەی خۆیان دا بەرهەم دەهێنا، بەڵام لە نێو نامەیەکدا کە لە قوژبنێکی ماڵەکەدا دۆزرابووەوە نووسرابوو، دوکتۆر ئەو ژنەی کوشتوە و لە نێو باخچەکەدا ناشتوویەتی.

ئەویش لە ترس و خۆف ئەوەی نەکا خەڵکی شار بە دەستی ئەو ژنە دەرمان داوی بکەن و لە نێوی بەرن. ئیسپاتکردنی ئەو قسانە کاری حەزرەتی فیل بوو، ئەویش لە کاتێکدا ئەم بابەتەیان ورووژاند هیچ کەس سەری خۆی بە مان و نەمانی دوکتۆرەوە نەدەئێشاند، پێم وا بێ کاربەدەستان ئەو شتەیان هەر لە بیریش نەمابوو، دوای ئەوەی حکوومەت کەسانێکی جێمتمانە و باوەڕپێکراوی خۆی بردە ڕیزی پۆلیسەوە و ڕۆحێکی نوێی بە بەر پۆلسدا کرد. چیرۆکی لە بیرکراوی نامەکەیان سەر لە نوێ ژیاندەوە و کاربەدەستان، دەرگاکانی ماڵەکەیان

شــكاند و هــەموو كــەلێن و قــوژبنی ماڵەكــەیان پشــكنی و حەوشــە و دەرگاوبانیان بە سەر یەكدا دا و تەنانەت نێـو ئاودەستەكەیش بـە شـوێن تــەرمی مێمێـدا گــەڕان، بـەڵام بـە ئەنـدازەی سەرەدرزییەكیشـان بەڵگـە دەست نەكەوت و دەملەپووش مانەوە، هـەر وەك ئـەوەی ئاسمـان هـەڵی لووشی بێ و ئەرز قووتی دابێ. هـەلێكی باشـیان دەسـت كـەوتبوو، هـەتا دوكتــۆر لــە ماڵەكــەی بەرنــە دەرێ و بــە بیــانووی نــەزم و یاســاوە لــە گۆڕەپانی شاردا لە داری بدەن، بـەڵام تولّـە لێـی بێـدەنگ نـەبوو، پشـت گوێی نەخست و لێ نەگەڕا هەر شتێكیان پێ خۆشە بیكەن، خـۆی كـردە خـاوەنی باسـەكە و هـات بـۆ لای مـن و داوای لـێ كـردم بچـم و چـاوم بـە دوكتۆر بكەوێ، بەو هیوایەی وەڵامێكی ڕوون و ئاشكرای لێ وەربگرم.

كاتێك بە دەرگای پشتەوەی ماڵەكەدا چووینە ژوورەوە، پیاوێكی دامـاو و زەلیلمان بـینی، وەك ژیشـكێكی ترسـاو لـە نێـو هەلۆركەكـەی دا گرمۆڵـە ببوو... پیاو لێی دەترسا. بە دیتنی ئێمە لـە نێـو هەلۆركەكـەی هەسـتا و دانیشـت، لـەو كاتــەدا سـامناكتر دەهاتــە بــەر چـاو، وا دیـار بـوو ئـەو تەپوتۆزەی لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا نیشتۆتە سەر كەلوپەلەكـەی ئـەو دیوە، ئەویشی لێ بێبەش نەبوە. سەری دەتگوت لـە پـۆڵا سـاز كـراوە و چاوە زەرد و بێ گیانەكانی هێشتا هەر وەك لە پێشدا دیتبووم شوێندانەر بوون، سمێڵی تاشی بوو، یانی هەر كەمێك كورتی كردبـوەوە، ڕدێنیشـی بە مقەستێكی باخەوانی هەڵپاچی بوو، تووكی چەناگەی وەك جاران زبر و پـڕ لـە چـاوی نـەدەدا، بـەڵكوو نـەرم تـەنك و سـپی بـوو. كاتێـك لـە نێـو

هەلۆرکەکەدا دیتم، هەستم کرد هەر لە مردوویەك دەچێ کە هێشتا چاوەکانی گیانیان تێدا ماوە و ڕۆح لە کونە لووتییەوە نەچوەتە دەرێ.

هەر وا پتەو و پڕ مانا و لەسەرەخۆ قسەی دەکرد، گوتی هیچ شتێك لەو بابەتەوە نازانم، چیتان پێ بڵێم؟ پێی وا بوو ئێمە ئاگامان لەوە نەبوە، کە پۆلیس دەرگاکانی ماڵەکەی شکاندوە و بە بێ مۆڵەت ماڵەکەیان داوە بە سەر یەکدا، بەڵام قسەکانی بۆنی گلەییان لێ نەدەهات، بەڵکوو پڕ بوون لە بێزاری و بێ باوەڕی و وڕێنە و قسەی هەلەقومەلەق.

لە بابەت مێمێوە هەندێك قسەی زۆر منداڵانەی کرد، شێوەی قسەکردنەکەی لەو وەختانە دەچوو، کە نەی دە ویست درۆی بەزاردا بێ.

گوتی، مێمێ لە مێژە ڕۆیشتوە... هەر ئەوەندە و هیچی تر، کاتێك دووکانەکەی داخست، لە ماڵێدا هەستی بە بێزاری و بێتاقەتی دەکرد، هەمیشە مات و بێدەنگ بوو، هاتوچۆی دەرەوەیشی نەدەکرد. گوتی، ڕۆژێك چەمەدانەکەی هەڵگرتوە و ئەو هیچی پێ نەگوتوە، مێمێ لە چەقی دەرگاکەدا دەوەستێ و متەقی لێوە نایەت، وەك ئەوە وا بنوێنێ خەریکە دەڕوات و بە جێی دەهێڵێ. گوتی کاتێك بە جلوبەرگی میوانی و پێڵاوی پاژنەبەرز و چەمەدان بە دەست دیتم، ورتەم لێوە نەهاتوە و هیچم پێ نەگوت.

دوکتۆر گوتی: «ئەو کاتە هەستامە سەر پێ و ئەو پووڵەی لە نێو چەکمەجەکەدا بۆم مابوەوە، دەرم هێنا و دامە دەستی.

لێم پرسی: «ئەمە چەند وەختێك دەبێ دوکتۆر؟

– «چاو لە سەروقژم بکەی تێ دەگەی، هەتا لێرە بوو سەروقژی بۆ کورت دەکردمەوە.

لە ماوەی ئەو دانیشتنەمان دا تولّە قسەیەکی وای نەکرد، تەنانەت ئەو کاتەی هاتە نێو وەتاغەکەوە، دەتگوت بە ڕواڵەت بە دیتنی ئەو پیاوەی لە ماوەی پازدە ساڵ مانەوەی لە ماکاندۆدا نەی دیتبوو ڕاچڵەکی. لەو ساتەدا (لە بەر ئەوەی سمێڵی تاشی بوو) هەستم کرد ئەو دوانە زۆر شێوەی یەکتری دەدەن، زۆر زۆر لە یەکتری نەدەچوون، بەڵام وەك دوو برا، گەلێك خاڵی هاوبەشیان تێدا بوو، یەکیان هەندێك پیرتر و لاوازتر و پەککەوتووتر دەهاتە بەر چاو. پاشان کەوتمەوە بیری ئەو شەوەی بەر هەیوانەکە و گوتم: «دوکتۆر، ئەوە تولّەیە، بەڵێنت پێدا بووم کەڕەتێك بچیتە سەردانی.

پێکەنی، چاوێکی لە قەشە کرد و گوتی: «ڕاست دەکەی سەرهەنگ، نازانم، چۆن بوو نەچووم.» چاوەکانی تێ بڕیبوو تەماشای دەکرد، هەتا ئەوەی تولّە بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی: «هیچ کاتێك بۆ دەستپێکردنی ئەو کارانە درەنگ نییە، پێم خۆشە ببمە هاوڕێت.

دەستبەجێ هەستم کرد تولّە ئەوهەیبەت و شکۆیەی پێشووی نەماوە و لە بەرانبەر ئەو غەوارەیەدا هەست بە کەمی و لاوازی دەکات، بە شەرمەوە قسەی دەکرد. دەنگی دەلەرزی و ئەو نرکەوگوڕەی جارانی لێوە نەدەهات. ئەو دەنگەی جاران لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆژمێری بریستۆلدا وەك نرکەی گەردەلوولێك پێلی دەسەند و بەرەو ئامێزی ئامان کفارەی دەبەست، تەواو لە کزی دابوو.

ئەوە یەکەمین و دواهەمین کەرەتیان بوو لە نزیکەوە چاویان بە یەکتری دەکەوت. ژیانی دوکتۆر لەو شەوەوە هەتا ئێستا درێژەی کێشا بوو، ئەو کاتەی خەڵکی برینـدارەکانیان بردبـوە بـەر دەرگـا و داوایـان لـیٚ کردبـوو هەتا بۆ چارەسەری برینداره‌کانیان یارمەتییان بدات، بـەڵام دوکتـۆر هـەر دەرگاکەیشـی لـیٚ نەکردبوونـەوە و ئـەوانیش بـە سـەریان دا گوڕانـدبوو، هەڕەشـەیان لـیٚ کردبـوو کـە ڕۆژێـك تۆڵـەی ئـەو کـارە ناحـەزەی لـیٚ دەکەنەوە، تولـەیش کـەوتبوە بـەینیان و بـە هـەر شـێوەیەك بـیٚ ئـارامی کردبوونـەوە. ئێسـتا مـن بـۆ ئـەوە هاتوومەتـە ئێـرە، هـەتا بـەرگری لـە بەرێوەبردنی ئەو بەڵایە بکەم کە لەو سەردەمەوە هەتا ئەمڕۆ وەك سێبەر بە شوێنیەوەیەتی و ساتێك بە جێی نەهێشتوە، ئێستایش خەریکە وەك مۆتەکە بەربینی دەگریٚ و دەیخنکێنیٚ. ئێستا من هاتبووم بـەڵکوو بتـوانم لە دەست ئەو داهاتوە سامناکە ڕزگاری بکەم.

ئەو کاتەی خەریك بووین لە ماڵەکەی دەردەکەوتین، کەوتەوە بیرم، چەند ساڵێك بوو شتێك لە سەر دڵم دا ببوو بـە گـریٚ و دەمەویسـت پرسـیارێکی لیٚ بکـەم و ئـەم گرێکـوێرەی دەروونم بکەمـەوە. ڕووم کـردە تولـە و پـێم گوت، هـەتا تـۆ دەچـی و کـەمێك بـە دەوری بەرپرسـەکان دا دێیـت و لـە کەری شەیتان دەیانهێنێتە خواریٚ، بـا مـن برێکـی تـریش لـە لای دوکتـۆر بمێنمەوە، کاتێك ئەو ڕۆیشت و بە جێـی هێشـتین، لـێم پرسـی: «دوکتـۆر دەکریٚ پێم بڵێی منداڵەکە چی بە سەر هات.

بیٚ ئەوەی بە ڕووی خۆی بهێنیٚ و تۆزقاڵێکیش تێك بچـیٚ، گـوتی: «کامـە منداڵ سەرهەنگ؟

لە وەڵامی دا گوتم: «منداڵەکەتان، کاتێك لە ماڵی ئێمە هاتنە دەرێ مێمێ دووگیان بوو.

زۆر لەسەرەخۆ وەڵامی دامەوە و گوتی: «ڕاست دەکەی سەرهەنگ، ئەوم هەر لە بیریش نەمابوو.

£

£

بابم بێدەنگ بوو... پاشان گوتی: «تەنانەت ئەگەر بەزەبری شیلاقیش بێ تولە ناچاریان دەکات بە پێی خۆیان بێنە ئێرە.

نێو چاوی بابم لە تووڕەییدا بەردی لێ دەباری، نیو کاتژمێر بوو چاوەڕێ بووین. دڵنیگەران و پەرێشانی کوڕەکەم بووم، نیگەرانی ماتی و بێدەنگییەکەی... ڕواڵەتی پڕ بوو لە یادەوەریی باوکی و هەر چەندەم لێ دەڕوانی، ئەوی بیر دەخستمەوە، کوڕەکەم خەریك بوو بە دەم هەوای گەرمی ئەو چوارشەممەیەوە بەرەبەرە وەك چلوورە سەهۆڵ دەتوایەوە، ڕاست وەك ئەو ڕووداوەی نۆ ساڵ لەمەو بەر بۆ مارتین هاتە پێشێ. ئەو کاتەی لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەوە دەستی بۆ تەکان دام و بۆ هەمیشە لە بەر چاوان بزر بوو، ئەگەر تەواوی ئاکار و ڕەفتاری ئەم کوڕەیش بچێتەوە سەر بابی، تەواو ڕەنج بە خەسار دەبم و ئەم هەموو ماندوو بوون و لەخۆبردوویییەم بە فیڕۆ دەچێ و هیچی لە بەر چاو نابێ. لە خودا داوا دەکەم جەستەی پێ ببەخشێت، هەتا ئەویش وەك هەموو مرۆڤێك ئەندازە و کێش و ڕەنگی خۆی هەبێ. هەتا ئەو کاتەی خوێنی

ئەو بابەی لە دەرووندا بگەڕێ، نابێ هیوات بەم کوڕەیش بێ و هەموو شتێك مایەپووچە. پێنج ساڵ لەمەو بەر هەموو شتێکی ئەم کوڕە لە مارتین دەچوو، کەچی ئێستا لەو کاتەوەی جێنۆڤێڤا گارسیا لەگەڵ ئەو شەش منداڵەی کە دوانیان ئاواڵ دوانەن، هاتوونەتەوە ماکاندۆوە، دەڵێی هەموو شتێکی چۆتە سەر ئەوان.

جێنۆڤێڤا بەرەبەرە پیر و قەڵەو ببوو... دەوروپشتی چاوەکانی شین هەڵگەڕابوون. ڕووخساری ناحەز ببوو، ئەو ڕووخسارەی لە ڕابردوودا جوان و ڕێك و دڵفڕێن بوو، ئەو دیار بوو لە نێوان ئەو پێڵاوە سپییە چکۆلانانەدا و ئەو کەتانە چینداراانەدا، ژیانێکی پڕ لە بەختەوەری تێکەڵ بە ژاوەژاوەی هەبوو، خەبەرم بوو جێنۆڤێڤا لەگەڵ بەرپرسی یەکێك لە کۆمپانییەکاندا هەڵگیراوە و هەر کاتێك چاوم بە منداڵەکانی دەکەوت تەواو تێك دەچووم، ئەو منداڵانە هیچ کردەوە و ڕەفتارێکیان بە دەست خۆیان نەبوو، هەر دەتگوت لە ناوەندێکی خۆرسکی دوورەوە فەرمانیان وەردەگرت و دەجوولانەوە. هەڕەشەیشیان، بە جلوبەرگی کەتانیی چیندار و پێڵاوە دەستکردەکانیانەوە، ئەوەندە لە یەکتری دەچوون مرۆڤیان سەرسام دەکرد.

جێنۆڤێڤا زۆر خۆی بە بەختەوەر دەزانی، ئەو سڵسڵە و پلپلەی لە شارەوە لەگەڵ خۆی هێنابووی بە خۆی دا هەڵدەواسی و لووتی هەڵدەهێنا و فیزی بە سەر هەمووماندا لێ دەدا و بە بەزەیییەوە لێی دەڕوانین، پێی وا بوو ژیانی ئێمە و ئەو ژیانەی ئەو لە شاردا بوویەتی هەر خودایان یەکە. ئەم فیز و دەمار و خۆڕادانە لەم شارەدا کە تەپوتۆز

کردبوونییە وێرانە، شتێکی دزێو بێ مانا بوو، بە جێی ئەوەی بەغیلیی پێ بەرم و لێی بێزار بم، بەزەییم پێی دا دەهات و جارجاریش لە ناخی دڵەوە پێی پێدەکەنیم، بە دەم سەیرکردنییەوە کەوتمەوە یادی ڕابردوو پێم گوت: «ئەوەندە قەڵەو بووی دەڵێی فوویان داوی. بەتووڕەییەوە نێو چاوانی لێ تێك نام و گوتی: «بیرەوەرییەکانی ڕابردوو مرۆڤ قەڵەو دەکەن!» هەر بە ڕاوەستانەوە چاوێکی لە منداڵەکەم کرد و گوتی: «ئەرێ ئەو هۆقەبازە چواردوگمە چی بە سەر هات؟

منیش بەسەرهاتەکەم مووبەموو بۆ گێڕایەوە، چونکە هەموو شتێك دەزانێ، جێنۆڤێڤا گوتی: «هەر ئەوەی بۆ بە جێ هێشتی و بۆی دەرچوو، وایە؟» منیش لە وەڵامی دا گوتم، نا... بێجگە لەو منداڵە هیچی تری بۆ بە جێ نەهێشتم، خنوا دای لە قاقای پێکەنینەوە و گوتی: «دیارە پیاوێکی زۆر بێکارە و دەستەوەستان بوە، کە لە ماوەی پێنج ساڵدا تەنیا هەر منداڵێکی لێ کەوتوەتەوە!

بە نێو منداڵەکانی دا دەهات و دەچوو، مرقەمرق بە دەنگێکی بەرز پێدەکەنی، لە درێژەی قسەکانی دا گوتی: «من شێت و شەیدای ئەو بوو، خەریك بووم زوقرەی بۆ بکەم. سوێند و بەڵێنم وا بێ ئەگەر لە ڕێوڕەسمی شەوبێداریی ئەو منداڵەدا نەبوایە بە دڵنیاییەوە لێم هەڵدەگێڕایەوە و لە دەستم دەر دەهێنا! ئاخر ئەو سەردەمانە زۆرم باوەڕ بەو شتە پڕوپووچ و خوڕافییانە هەبوو.

جێنۆڤێڤا بەر لەوەی بڕوات ڕووی کردە منداڵەکە و چاوێکی لێ کرد و گوتی: «هەر کۆتێکی چواردوگمەیی لە بەر کەی کەس لێکیان ناکاتەوە.

دوای ئەو قسانە بەرەبەرە منداڵەکە لە بەر چاوم زیاتر و زیاتر لە بابی دەچوو، هەر دەتگوت جێنۆفێڤا ڕۆحی نەفرەتلێکراوی ئەوی لەگەڵ خۆی دا هێنابوو. جاروبارە چاوم تێ دەبڕی، ئانیشکەکانی دەنایە سەر مێزەکە، سەری هەندێك بە لای چەپەی دا دەنووشتاندەوە و ماتومەنگ چاوی لە شوێنێکی نادیار دەبڕی. هەر ڕاست وەك مارتین دەچوو، ئەو کاتەی پاڵی دەدا بە گوڵدانی مێخەکەکانی سەر لاجامەکەوە و دەیگوت: «ئەگەر لە بەر ئێوە نەبوایە، بە هیچ کولۆجێك لە ماکاندۆدا نەدەمامەوە...

جاری وا بوو هەستم دەکرد دەیەوێ ئەو قسەیەم پێ بڵێ، بەڵام ئێستا لە پەنامەوە دانیشتوە و دەست لە لووتە تاوە سووتەکەی وەر دەدا. لێم پرسی: «ئازارت دەدا؟» ئەویش لەوەڵامم دا گوتی: نا. پێی وایە ناتوانێ چاویلکە لە چاو بکات. پێی دەڵێم: «بیر لەوانە مەکەوە.» گرێی بۆینباخەکەی دەکەمەوە و دەڵێم: «ئەگەر چووینەوە ماڵێ، ئاوێ بکە بە خۆت دا و سەر خەوێك بشکێنە.» سەرم بەرەو لای بابم وەردەسووڕێنم، دەڵێ: «کاتائۆرە.» هەرای لە پیاوە گواجیرایییەکە کرد، ئەو لە هەموویان بەتەمەنتر بوو... پیاوێکی بە شان و باهۆ و کورتە باڵا بوو... لە سەرقەنەفەکە دانیشتبوو جگەرەی دەکێشا و کاتێك بانگی لێ کرد سەری هەڵدەهێنی و بە شوێن بابم دا دەگەڕێ، بەڵام کاتێك بابم دەست دەکاتەوە بە قسەکردن دەنگی هەنگاوەکانی سەرۆکی شارەوانی لە وەتاغەکەی پشتەوە دێ، کە بە لەتردان خەریکە دەچێتە ژووری نووستنەکەوە.

ئەم نیوەڕۆیە ماڵی ئێمە ترس و دڵەخورپەی لێ دەباری، سەرەڕای ئەوەی هەواڵی مردنی ئەو بۆ من شتێکی نامۆ و چاوەڕوان نەکراو نەبوو، چونکە ماوەیەکی زۆر بوو چاوەڕوانی بووم، پێم وا نەبوو مردنی ئەو پیاوە ئاژاوەیەکی ئاوا گەورە لە ماڵی ئێمەدا بنێتەوە. پێویست بوو بۆ ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنەکەی کەسێکم لەگەڵدا بێ و خێزانم بۆ ئەو کارە لە هەموو کەس شیاوتر بوو، دڵنیا بووم لەگەڵم دا دێت. بە تایبەت لە سێ ساڵ لەمەو بەر لە کاتی نەخۆشییەکەم دا، ئەو ئێوارەی لە کاتی پشکنینی چەکمەجەکەدا گۆچانە قەفزێوەکە و بووکەڵەدارینەی دیتبووەوە، پێم وا بێ لەو کاتەدا بووکەڵەکەمان هەر لە بیریش نەمابوو، بەڵام ئەو ئێوارەیە بەزەوقەوە خستمانەوە کار و ئەویش وەك جاری جاران بە ئاوازێکی خۆشەوە دەستی کردەوە بە سەماکردن و یادی ڕابردووی لە دەروونماندا ژیاندەوە. ئادێلایدا کە سەمای ئالێرینی بووکەڵەکەی چاو لێ دەکرد، ڕووی وەرگێڕا، ئەسرین ئەستێرەی

چاوەکانی زەلاندبوو، لێی پرسیم: «ئەو دیمەنە چ یادەوەرییەکت لە لا زیندوو دەکاتەوە؟

لەو کاتەدا کە بووکەڵەکە نێو وەتاغەکەی پڕ کردبوو لە شەپۆلی نەرمی ئاوازێکی قەدیمی و غەمگین، دەمزانی ئەو بیر لە چ کەسێك دەکاتەوە، بیری لەو ڕۆژانەی دەکردەوە، کە کاتژمێر شەشی ئێوارە پاڵی دەدا بە شانی دەرگاکەوە و چراکەی بە لاشیپانی دەرگاکەوە هەڵدەواسی، هەر بۆیە چاوە غەماوییەکانی تێ بڕیم و لێی پرسیم: «هەر نەت زانی چی بە سەر هات؟

گوتم: «چارەنووسە، هاکا لەم ڕۆژانەدا مرد و ئێمە ناچار بووین بچین بە خاکی بسپێرین.

ئادێلایدا بێدەنگ چاوی لە سەمای بووکەڵەکە بڕیبوو، منیش لە غەمی ڕابردوودا بووم، ئەو غەمەی هەست و بیر و هۆشی ئادێلایدای داگیر کردبوو، ڕووم تێ کرد و پێم گوت: «هەمیشە پێم خۆش بوو بزانم ئەو ڕۆژەی ئەو پێی نایە نێو ئەمماڵەوە، تۆ پێت وا بوو چ جۆرە مرۆڤێکە؟

ئادێلایدایش بە بزەیەکی تاڵ و پڕ لە کەسەرەوە گوتی:

-«ئەگەر ئێستا پێت بڵێم ئەو کاتەی لەو سووچەدا ڕاوەستابوو بووکەڵەکەی بە دەستەوە بوو، کێم کەوتبوەوە بیر. دڵنیام قاقا پێم پێ دەکەنی.» ئامازەی بەو شوێنە بەتاڵە کرد، کە بیستودوو ساڵ بەر لە ئێستا بە جلوبەرگی سەربازییەوە لەوێدا دیتبووی.

ئەو دوانیوەڕۆیە پێم وابوو ئەو دوو نەفەرە لە دڵی خۆیان دا ئاشتبوونەتەوە و ناکۆکییەکانیان وە لا ناوە، هەر لە بەر ئەوەیش ئەمڕۆ

بە خێزانم گوت، جلوبەرگی ڕەش لەبەر بکات و لەگەڵم دا بێت بۆ ئەوێ، بووکەڵەکە لە نێو چەکمەجەکەدا لە شوێنەکەی خۆی دایە، ئیتر ئێستا دەنگی ئاوازەکەی وەك جاران هەستبزوێن و شوێندانەر نییە.

ئادێلایدا ئێستا نەشئە و گەشەکەی جارانی نەماوە، دەچێتە وەتاغەکەی خۆی و زۆربەی کاتە بەتاڵەکانی بە دوعا و پاڕانەوە پڕ دەکاتەوە، پێی گوتم: «تەنیا هەر تۆی خۆت بە ناشتنی تەرمی کەسێکی ئاواوە ماندوو دەکەی. پاش ئەوەی ئەو بەلا گەورەیەمان بە تووشەوە بوو، ئیتر هەر ئەم ساڵە کەبیسە نەفرەتییمان کەم بوو، پاشانیش تۆفانی گەلا.» زۆرم هەوڵ دا ڕازی بکەم، کە من پێشتر من بەڵێنیم بەو پیاوە داوە و تازە بە هیچ کولۆجێك ناتوانم خۆی لێ بدزمەوە.، گوتم: «ناتوانم ئەوەندە سپڵە بم چاکەکەی بە ئاو دادەم و ئەوەم لە بیر بچێتەوە، هەر ئەو بوو گیانی لە مردن ڕزگار کردم، هەتا بە سەر زیندووم، خۆم بە منەتباری ئەو دەزانم.

ئادێلایدا گوتی: «جا تۆ بۆ؟ ئەو گیان و ژیانی قەرزداری تۆیە، بە ڕزگارکردنی گیانت لە ڕاستیدا قەرزی ئەوەی داویتەتەوە کە هەشت ساڵ لە ماڵەکەت دا ژیاوە و خواردوویەتی و پۆشیویەتی و بە ئاسوودەیی لاقی لێ ڕاکێشاوە.» پاشان هەستا چوو کورسییەکی هێنا و لە تەنیشت لاجامەکانەوە دای نا. لە سەر قسەی خۆی سوور بوو. هەوڵم دا هەندێك هێوری بکەمەوە. پێم گوت: «زۆر باشە، تۆ مەیە، لەگەڵ ئیزابێلدا دەچم.» ئیتر هیچی نەگوت و لە سەر جێگاکەی خۆی دانیشت.

کاتێك خەریك بووین ڕێ دەکەوتین، بۆ ئەوەی لێم نەڕەنجێ پێم گوت: «هەتا ئێمە دەگەڕێینەوە، تۆیش بچۆ بۆ کلێسا و دوعامان بۆ بکە و بۆمان بپارێوە.

ئاوڕی لێ دامەوە و گوتی: «تا ئەو کاتەی ئەو ژنە هەموو سێ شەممەیەك دێ و چڵێك لیمۆمان لێ وەردەگرێ. پاڕانەوە و لالانەوەکانم بێ سەمەرن.

بە دەنگێکی پڕ لە خەو و حەسرەتەوە گوتی. «تا ڕۆژی قیامەت وەك مرۆڤە دۆڕاوەکان لە سەر جێی خۆم دادەنیشم... ئەگەر تا ئەو ڕۆژە مۆڕیانەکان کورسییەکەی ژێرم لە بەر یەك هەڵ نەوەشێننەوە.

£

£

بابم هەندێك سەبر دەکات و چاوێك بە نێو دیوەکەدا دەگێڕێ.

گوێی بۆ ئەو هەنگاوانە شل دەکات لە دیوەکەی پەنامانەوە دەنگی دێ و وردەوردە خەریکە لێمان نزیك دەبێتەوە، پاشان لە بیری دەچێتەوە دەیەویست چی بە کاتائۆرە بڵێ و هەوڵ دەدات بە یارمەتیی گۆچانەکەی هەندێك بسوورێت، بەڵام لاقە شەلەکەی لە کاتی سووڕاندا لەگەڵی نەهات و زۆری نەمابوو بکەوێ بە ئەرزەکەدا. ڕاست وەك ئەو ڕووداوەی سێ ساڵ لەمەو بەر ڕووی دا. ئەو کاتەی کەوت بە سەر پەرداخی ئاولیمۆکەدا و دەنگی کەوتنی پەرداخەکە و پێڵاوە دارینەکانی و دەنگی کورسییە بێشکەییەکە و زیرەی منداڵەکە بە یەکەوە بەرز بوونەوە.

لەو کاتەوە تا ئێستا دەشەلێ، دوای چەند هەفتەیەك ئێش و ئازارکێشان لاقی ڕەق بوو، بەزۆرییش لە دووی نەدەهات. پێمان وا بوو تازە هەرگیز چاك نابێتەوە و لەمە بەو لاوە دەبێ هەتا مردن هەر بە دووی خۆی دا بە کێشی بکات. ئێستا کە دەبینم حاڵی ئاوا شپرزەیە و بە یارمەتیی سەرۆکی شارەوانییەوە خۆی بە پێوە ڕادەگرێ، دەزانم لەبەر چی بە دژی ویستی خەڵك وەستاوە و قۆڵی لێ هەڵماڵیوە و لە سەر قسەی خۆی سوورە... ڕازی ئەمەکداری و پێ زانینی ئەو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی لە بەرهەیوانەکە کەوتبوو لاقی شکابوو، دوکتۆرەکانی ماکاندۆ جوابیان کردبوو، پێیان گوتبوو سەرینی ئەرخەیانی بنێتە ژوور سەری و با بەرەبەرە خۆی بە دەستی مردن بسپێرێت.

پێنج ڕۆژ بوو لە جێگادا کەوتبوو، ئەو ڕۆژەی بەتانییەکانی لە خۆی هاڵاندبوو، تەواو تێك چووبوو، جوان لە بیرمە، وەك پارەکەی توڵە دەهاتە بەر چاوم، ڕۆژێکی پڕ لە غەم و پەژارە بوو، خەڵکی ماکاندۆ هەر کەسە و بە چەپکێك گوڵەوە کەوتبوونە شوێن تابووتەکەی، گوڵەکان ئەوەندە زۆر بوون، دەتگوت چەپکەگوڵن و بە ڕێدا دەڕۆن، بە دڵێکی پڕ لە غەم و ئازارەوە، تابووتەکەیان بەرەو گۆڕستان بە ڕێ دەکرد. ئەو ڕۆژەیش ڕووخساری بابم غەمی لێ دەباری، لە سەر جێگاکەی ڕاکشابوو، بە دەنگێکی بەرز چیرۆکی ئەو سەربازە غەریبەی دەگێڕاوە، کە لە شەڕی ساڵی ١٨٥٥دا شەوێك لە ناکاو دێتە ئۆردووی سەرهەنگ ئورلیانۆ بۆئیندیا، ئەو سەربازە کڵاو و پۆتینەکانی بە پێست و ددان و پەنجەکانی پڵینگ نەخشێنرابوون و کاتێك پرسیاریان لێ کردبوو: «تۆ کێی؟»

سەربازە غەوارەکە وەڵامی نەدابوونەوە، هەروەها کاتێك لێیان پرسی: «خەڵکی کوێی؟» وەڵامی نەدابوونەوە، کاتێك لێیان پرسیبوو: «شەڕ بۆ کێ دەکەیت؟» دیسان هیچ وەڵامێکیان لێ نەبیستبوو، هەتا ئەوەی خزمەتکارێك مەشخەڵێکی هەڵگرت و لە بەرانبەر سەروچاوی دا ڕای گرت و هەندێك تێی ڕاما و بە خەجاڵەتییەوە هاواری لێ هەستا: «یا حەزرەتی مەسیح... کوڕە خۆ ئەوە دوك مارلبرۆیە!

لە کاتێکدا هەموو گیانی وەك تەنوور داگیرسا و بەردەوام وڕێنەی دەکرد، دوکتۆرەکان گوتیان، دەبێ حەمامی پێ بکەین، بەڵام حەمامەکەیش سوودێکی وای نەبوو، بۆ ڕۆژی دواتر گۆڕانێکی کەم لە زگی دا هەست پێ دەکرا. لەو هەلومەرجە هەستیارەدا بەرەبەرە دوکتۆرەکان خۆیان لێ دزییەوە و ماڵەکەیان چۆڵ کرد و گوتیان چمان لە دەست نایە و چار ئەوەیە کارێك بکەین هەتا دەمرێ زۆر ئازار نەچێژێ.

کەشوهەوایەکی ئەوەندە ئارام باڵی بە سەر دیوی نووستنەکەدا کێشابوو، تەنیا هەر دەنگی باڵەکانی مردن دەبیسرا. دوای ئەوەی باوە ئانخێل ڕێوڕەسمی کۆتایی بە ڕێوە برد و یاسینی لە سەر خوێند، ماوەیەکی زۆری پێچوو، هەتا یەکەم کەس لە جێی خۆی جووڵەی کرد و چاوێکی لە ڕووخسارە وشکهەڵاتوەکەی کرد، کاتێك کاتژمێرە دیوارییەکە زەنگی لێ دا، زڕدایکم هەستا بچێت دەواکانی بۆ بهێنێ، لەو کاتەدا گوێمان لە دەنگی هەنگاوە هێواشەکانی بوو گەییشتبوە هەیوانەکە. زڕدایکم لە جێی خۆی وشك بوو، کەوچکەکەی هەر وا بە حەواوە ڕاگرتبوو. دوعاکەی بڕی و ڕووخساری سوور هەڵگەڕا و بە تاساوییەوە چاوی لە دەرگاکە بڕی.

چاومان بـه دوکتـۆر کـەوت. تـەنیا تـوانی ئەوەنـدە بڵـێ: «تەنانـەت لـە جەهەندەمیش دەنگی ئەو هەنگاوانە دەناسمەوە!
لە چەقی دەرگاکە ڕاوەستابوو چاوی لە ئێمە دەکرد.

£

£

بە کچەکەم دەڵێم: «تەنانەت ئەگـەر بـە زەبـری شـێلاقیش بـێ، توڵە ئەوانە دەهێنێتەوە ئێرە.
دەچمە سەر تابووتەکە، بیر لەوە دەکەمەوە، لەو کاتەوە دوکتۆر لە مـاڵی ئێمە ڕۆیشـتوە، هەسـتم کـردوە کارەکـانی مـاڵی ئێمـە دراونەتـە دەسـتی هێزێکی نادیار و بێکۆتاییەوە و ئێمە ناتوانین بە دژی ویسـتی ئـەو هێـزە نادیارە، دەست لە ڕەشوسپی بدەین و تەنانەت ئەگەر هەموو توانایشمان بخەینە سەر یەك، بەردێکمان لە سەر بەردێك پـێ دانانرێـت، ئەگـەر بـیر و باوەڕە بێ سەمەرەکەی ئادێلایـدایش بگرینـە بـەر و هـەموو هێـز و کـاتی خۆمان بۆ نزا و پاڕانەوە تەرخان بکەین، دیسان هیچمان لە دەست نایـە، هەر لەو کاتەدا چاوێك بـە پیاوەکـانم دا دەگێـڕم، کـە لـە سـەر قەنەفەکـە دانیشـتبوون و هەسـت دەکـەم خەریکـە یەکـەم هەناسـەم لـەو هەوایـە هەڵدەمژم، کە تازە لە سەر مردوەکـەوە هەسـتاوە و گەییوەتـە لای مـن. تامی ئەو هەوا تاڵە هەست پێ دەکەم، کە ماکاندۆ و وێرانی کـرد و بـردی بـە قـوڕدا، پـێم وا نییـە سـەرۆکی شـارەوانی نووسـینی مۆڵەتنامەکـە بـە درەنـگ بخـات، دەزانم خـەڵکێکی زۆر لەبـەر گـەرما ڕاوەسـتاون و

چاوەڕوانمانن و ژنەکان لە پشت پەنجەرەکانیانەوە بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانن و ئاگایان لێ نییە شیری سەر ئاگرەکەیان خەریکە هەڵدەچێ و برنجەکەیان خەریکە بسووتێ، بەڵام من دڵنیام، بەڕێوەبردنی پەردەی کۆتاییی ئەم شانۆ پڕ لە غەم و ئازارە لە توانای ئەم خەڵکە هەژار و بێدەرەتان و داماوەدا نییە و ناتوانن دەروەستی بێن.

لەو ڕۆژی یەکشەممەوە کە بۆ هەڵبژاردن دیاری کرابوو، خەڵکەکە وە جموجووڵ کەوتبوون، گەلاڵەیەکی زۆریان دادەڕشت و بەردەوامیش ناکام و دەم لە پووش مانەوە، دوای ئەو هەموو ماندووبوونەیش کە زانییان خۆیان هیچ کارە نین و بڕیاردان و ڕیش و گوریس هەر بە دەست ئەوانەوەیە، ورەیان لە دەست دا و توانای شەڕ و بەرەبەرەکانێکردنیان لە کزیی دا. دە ساڵ لەمەو بەر کاتێك ئەم بەڵایەمان بە سەردا باری، ئەو کەسانەی بە شوێن باشترکردنی هەلومەرجەکەوە بوون، هێز و توانایان بەشی پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ و نەوژەنکردنەوە دەکرد، باشترین کارێك کە دەبوو لە سەرەتاوە بیکەن، ئەوە بوو بەرەو ئەو مەزرایانە وەڕێ بکەون، کە لە لایەن کۆمپانیای مۆزەوە وێران کرابوو. گژوگیاکانیان بژار بکەن و سەر لە نوێ دەست بە چاککردن و نەوژەنکردنەوەی هەموو شتەکان بکەنەوە و شان بدەنە بەر کار و تێکۆشان و ئاوەدانکردنەوەی وڵات.

بەڵام ئەوان تۆفانی گەڵایان زۆر برۆز و بە پەلە و بێ سەبر بار هێنابوو، کە هیچ باوەڕێکیشی بە ڕابردوو و داهاتوو نەبێ، بە شێوەیەکی وا باریان هێنابوو، کە چاوی هەر لە ئێستا بێ داهاتوو نەبینێ و هەموو هەوڵەکانیشی بۆ مسۆگەرکردنی ویست و داخوازییەکانی خۆی بێت. تەنیا

ئەوەی پێویستمان پێی بوو هەندێك كات بوو هەتا بۆمان ڕوون ببێتەوە، تۆفانی گەلاّ ڕۆیشتوە و بە بێ ئەویش هیچ كارێكمان لە دەست نایە. تۆفانی گەلاّ هەموو شتێكی لەگەڵ خۆی دا هێنا و هەموو شتێكیشی لەگەڵ خۆی دا برد و تەنیا شتێكی دوای خۆی بۆی هێشتینەوە، یەكشەممەیەكی ئاڵۆزی پڕ لە زبڵوزاڵ و شارێكی شێواو و پلاندارێژێكی ئامادە و زیت و چالاك لە بواری هەڵبژاردندا بوو. لە دوایین شەوی ماكاندۆدا، كە لە گۆڕەپانی گشتیی شاردا دەستی پۆلیس و بەرپرسانی شاری لە خەنە گرتبوو.

ئەو شەوە ئەگەر تولّە بیتوانیایە (بە سەرنجدان بەو ڕاستییەی، هەڵچوون و شەپۆلانی خەڵكی هەر لە پەرەسەندندا بوو.) ئەوانە ناچار بە پاشەكشێكردن بكات. ئەوڕۆ لە توانایدا هەبوو وەك سەگرەوێنێك، سەر بكات بە هەموو ماڵێكدا و ڕازییان بكات هەتا لە ڕێوڕەسمی بەخاكسپاردنی ئەو پیاوەدا بەشداری بكەن. تولّە توانی بە زەبر و زەنگێكی پولاّین، هەموویان بهێنێتە ژێر ڕكێفی خۆیەوە. سەرەڕای ئەوەی قەشە چوار ساڵ بەر لە ئێستا كۆچی دوایی كردبوو، ئەو دابونەریتەی ئەو دای ڕشتبوو و بەردەوام هەست پێ دەكرا و بە ڕێكوپێكی مابوەوە، لە ڕۆژەدا دەتگوت تەواوی خەڵكی شار دار و گوڵی باخچەكانیان ڕووتاندۆتەوە و ئەوەی گوڵ و گەلاّی جوانیان پێوە بوە هەڵیان پاچیوە و بۆ نیشاندانی ئەمەكداریی خۆیان بە ڕێزەوە هێناویانە و لە سەر قەبرەكەی تولّە دایان ناوە.

ئەم پیاوە تەنیا کەسێك کە لە ڕێوەڕەسمی ناشتنەکەی دا بەشداریی نەکرد، ئەویش کەسێك، کە گیان و مانی خۆی قەرزداری گوێڕایەڵی بێ ئەملاوئەولای خەڵکی شار لە قەشە بوو، لە بەر ئەوەی لەو شەوە خوێناوییەدا ماکاندۆ ببوو بە شارێك بۆ ململانێ و تەراتێنی چەکدارە توندئاژۆکان. ئەو شارە خەواڵوەی مردوەکانی بە یەکەوە لە نێو کۆڕێکی بە کۆمەڵدا ناشت، لە نێو ئەو ئاوربااران و خۆێنڕشتنەدا کەسێك دەکەوێتەوە بیری، کە دوکتۆرێك لەو نزیکانەدا دەژی، خەڵکەکە هەرووژمی بۆ دێنن و دارەتەرمەکانیان لە شانی دەرگاکەوە دادەنێن و هەرای لێ دەکەن: «دوکتۆر، ئەو بریندارانەمان بۆ دەرمان بکە... زۆرمان پێویستە و لەم دەوروبەرانەیش دوکتۆرمان دەست ناکەوێ.

ئەویش لە وەڵامیان دا دەڵێ: «هەڵیان بگرن و بیانبەن بۆ شوێنێکی تر، من هیچم لە دەست نایەت.

ئەوانیش تکای لێ دەکەن و دەڵێن: «لەم نزیکانە بێجگە لە تۆ دوکتۆرێکی تری لێ نییە، بە خاتری خودا وەرە دەرێ و یارمەتیمان بدە و نائومێدمان مەکە.

خەڵکەکە پێیان وابوو ئێستا لە ناوەڕاستی وەتاغەکەدا ڕاوەستاوە، بەڵام ئەو هەر وا کە چرا نەوتییەکەی نابوە سەر سەری و چاوە زەرد و بێبەزەییەکانی دەبریسکانەوە، (هێشتا دەرگاکەی نەکردبوەوە) پێی گوتن: «ئەوەی لەو بارەوە دەمزانی، هیچم لە بیر نەماوە، بیانبەن بۆ شوێنێکی تر.

پشت ئەو دەرگا داخراوە بوو بە ماڵی هەمیشەیی. (لە بەر ئەوەی ئیتر هیچ کاتێك ئەو دەرگایە بە ڕووی کەسدا نەکرایەوە.) لەو کاتەدا ژنان و پیاوانی ماکاندۆ لەو دیوی دەرگاکەوە بە گیانەڵلاوە بوون، خەڵکەکە دەیانەویست ماڵەکەی بە سەردا ئاور تێ بەر بدەن و بیکەنە خۆڵەمێش، بەڵام لە ناکاوێك توڵە دەگاتێ، وەك دەڵێن بەدزییەوە لەوێ بوە، لە بەر ئەوەی نەهێڵێت ماڵەکە ئاور بدەن و ئەو پیاوەیش لە مردن ڕزگار بکات. توڵە پێیان دەڵێ: «کەس مافی ئەوەی نییە دەست بۆ ئەو دەرگایە ببات!

ئەوە تەنیا ڕستەیەك بوو لە زاری ئەو هاتە دەرێ، دەستەکانی وەك سەلیب لە بەر یەك ڕەواندبوەوە، قەڵافەتە کز و لاوازەکەی ئاوری لە سەر هەڵدەستا. دوای ئەوە شەپۆلی تووڕەییەکە دادەمرکێتەوە، ئاراستەکەی دەگۆڕێ، بەڵام هێشتا ئەوەندەیان وزە و توانا تێدا مابوو، هاوار و هەڕەشە بکەن و یەکدەنگ بڵێن، ڕۆژمان دێتەوە، کنگر و ماست بۆ وەختی خۆی با ئەو چاوەڕوانییە سەدان سەدەیش بخایەنێت، سەرەنجام ئەو ڕۆژی چاوەڕوانی بوون ئەم چوارشەممەیە بوو.

خەرمان خەرمان بەرەو قەنەفەکە ڕێ دەکەوم، هەتا بە پیاوەکان بڵێم دەرگاکە بکەنەوە. لە دڵی خۆم دا دەڵێم: «ئێستا وەختی ئەوەیە، ئەگەر پێنج خوولەکی تر نەگاتە ئێرە، بە بێ ئیزننامەی ناشتن، تابووتەکە هەڵدەگرم و دەیبەمە دەرێ و لە سەر شەقامەکە دای دەنێم، هەتا ڕاست لە چەقی دەرگاکەدا بینێژن!

-«کاتـائۆرە...» بـانگ دەکـەم، ئـەو لـە تـەواوی پیاوەکـانی تـرم بـە تەمـەنترە. هـەتا ئـەو سـەر هـەڵبهێنێ، هەسـت دەکـەم گـوێم لـە دەنگـی پێڵاوەکانی سەرۆکی شارەوانییە، لە دیوەکەی پەنامانەوە دێتە ژوورەوە. دەزانم ڕاسـت ڕوو دەکاتــە مـن و منـیش هـەوڵ دەدەم و بـە یارمــەتیی گۆچانەکەم و لە سەر پاژنەی پێم، بەرەو لای ئـەو وەر دەسـووڕێم، بـەڵام لاقـە شـەلەکەم لـە دووم نایـەت و بـە پێیشـدا سـەرەنگرێ دەبەسـتم و دەمەوڕوو دەکەوم بە سەر تابووتەکەدا، لە بەرانبەر سەرۆکی شـارەوانیدا تـل دەدەم و بــە یارمــەتیی دەســتەکانی خـۆم ڕادەگـرم. گـوێم لــە دەنگییەتی، بە لاژەلاژ دەڵێ: «نیگەران مەبـە سـەرھەنگ دڵنیـات دەکـەم هچ شتێك ڕوو نادات.

بۆ خۆیشم هەر لە سەر ئەو باوەڕەم، دڵنیام هیچ نابێ، بـەڵام دەزانم ئـەو قسە لە بەر ئەوە دەکـات، هـەتا ورەیـەك بداتـە بـەر خـۆی. پێـی دەڵێم: «منیش پێم وا نییە هیچ شتێکی وا ڕوو بدات.

بەڵام لە ڕاستیدا، بە پێچەوانەی ئـەو بـیر دەکەمـەوە. مۆڵەتنامەکـەی لـێ وەر دەگرم و بێ ئەوەی چاوی لێ بکەم و بیخوێنمـەوە دەینووشـتێنمەوە و دەینێمە گیرفانم و پێی دەڵێم: «دیارە هەر شتێکیش بڕیار بێ ڕوو بدات ئەوە ڕوو دەدات، ئێمە بەرمان پێ نـاگیرێ، ڕاسـت وەك ئـەوەی لـە ڕووی ڕۆژژمێری ئەستێرەناسییەوە ڕایان گەیاندبێ.

سـەرۆکی شـارەوانی دەچێتە لای سووڕپێسـتەکان. فـەرمانیان پـێ دەدا هەتا بزمارەکانی سـەر تابووتەکـە داکـوتن و دەرگـای دیوەکـە بکەنـەوە. هەڵدەسـتنە سـەرپێ و بـە شـوێن بزمـار و چەکووشـدا دەگـەڕێن، هـەتا

ڕووخساری ئەو پیاوە بۆ هەمیشە بشارنەوە. ئەو پیاوە بێ سەروسامان و بێ کەسوکار و بنەچەکەی، سێ ساڵ لەمەو پێش بۆ دوایین جار لە کاتی نەخۆشییەکەم دا دیتبووم، هاتبوە سەرکێشیم، پیرییەکی ناوەخت چرچولۆچیی خستبوە ڕووخساری و ڕەنگی پیریی لێ نیشتبوو، بەو هاتنەیشی گیانی منی ڕزگار کرد. هەر ئەو هێز و تواناییەی هەواڵی نەخۆشییەکەی منی پێدا بوو، باڵکێشی کرد و هێنایە ئێرە، وەك دەڵێن هەر ئەو هێزە نادیارەیش بوو لە پەنای قەنەفەکەی مندا ڕای گرت، هەتا بڵێت: «جێی مەترسی نییە هەر هەندێك لاقوقولت بۆ داماڵن چاك دەبێتەوە، لەوانەیە پێویست بێ لەمە بەو لاوە دەست بدەیتە گۆچان.

دوو ڕۆژ دوای ئەوە لێم پرسی من چەندەی پێ قەرزدارم و ئەو لە وەڵامم دا گوتی: «کوا تۆبە من قەرزداری سەرهەنگ، بەڵام ئەگەر دەتەوێ لە پیاوەتییە بێ سنوورەکەی خۆت بێبەشم نەکەی، تکایە ئەو کاتەی مردم و چاوت بە جەستەی بێ ڕۆحم کەوت، بە دەستی خۆت بمنێژە !... ئەوە گرینگترین شتێکە من پێویستم پێیەتی، هەتا نەبمە خۆراکی قەل و داڵ.

لە شێوەی دەربڕین و جۆری داواکارییەکەی و دەنگی قەدەمە لاوازەکانییەوە دەردەکەوت، ئەم پیاوە زۆر لە مێژە دەستی کردوە بە مردن. هەر چەندە بۆ ئەوەی ئەو مردنە نیوەکار و بەئەسپایی و لەسەرەخۆیە بگاتە سەرەنجام، ماوەی سێ ساڵ پێویست بوو، ئەو ڕۆژە ئەمڕۆکە بوو.

دڵنیام ئەو بۆ مردن پێویستی بە پەت و دار نەبوو، تەنیا سۆزی شنەیەکی نەرم تەواو بوو، بۆ ئەوەی گڕی نێو چاوە زەردەکانی بکوژێنێتەوە، ئەو شەوەی لە وەتاغە چکۆڵەکەدا قسەمان دەکرد، هەستم بەوانە کردبوو، بەر لەوەی لەگەڵ مێمیّ بێنە ئەم ماڵەوە. کاتێك ئەو بەڵێنەی لیّ وەرگرتم و ئێستا ئەوە خەریکی بە ڕێوە بردنیم، هەست بە پەشیمانی ناکەم. هەر ئەوەندەم پیّ گوت: «پێویست بە گوتن ناکات، دوکتۆر، خۆ من و تۆ غەریبە نین، دڵنیا بە ئەگەر پێی ناودارت نەبوایەم، بە تەنیا بالیش بوایە لە سەر شانم دادەنای و بە هەر شێوەیەك بیّ بە خاکم دەسپاردی.

دوکتۆریش بە بزەیەکەوە چاوە زەردە بێبەزەییەکانی تیّ بڕیم و گوتی: «ئەوە ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستی و ئەمەکداریی تۆیە. سەرهەنگ، بەڵام ئەوەت لە بیر نەچیّ هیچ کاتێك مرۆڤێکی مردوو ناتوانیّ بمنێژێت!

£

£

ئێستا کەس ناتوانیّ ئەم شەرمەزاری و ڕیسواییيە پەردەپۆش بکات. سەرۆکی شارەوانی مۆڵەتنامەی ناشتنەکەی دایە دەست بابم و گوتی: «دیارە ئەو شتەی قەرارە ڕوو بدات هەر ڕوو دەدات و کەس ناتوانیّ بەری پیّ بگریّ. ڕاست وەك ئەوەی لە ڕووی ڕۆژژمێری نجوومییەوە ڕایان گەیاندبێت.

ئەم قسەیە لە زاری ئەو هاتە دەریّ، ئەویش هەر بەو شێوەی کە خۆی دابوە دەست چارەنووسی ماکاندۆوە. لەو کاتەوە هەموو شتێك بەرەو

توانـەوە و نـابووتی دەڕۆیشـتن، ئێسـتا دایەگـەورەم ئـەو دەسـەڵات و توانایییەی جارانی نەماوە و لە هێز و توانـا کـەوتوە، ڕۆژبـەڕۆژ لاوازتـر و بـێ دەسـەڵاتتر دەبـێ و ورەی خـۆی تـەواو لـە دەسـت داوە، ئـەمڕۆ لای ئێوارە لە تەنیشت لاجامەکان دانیشت و گـوتی: «هـەتا ڕۆژی پەسـلان ئـا لێرەدا وەك مرۆڤە نامو راد و دۆڕاوەکان دادەنیشم.

بابەگەورەم ئەوڕۆ نەبێ هیچ کاتێك ویستی خۆی بەزۆری بـە سـەر کەسـدا نەسەپاندوە. کاتێك لە خەو هەستا هەتا بەڵێنییـە پـڕ لـە ڕیسـواییەکەی خـۆی بەرێتـە سـەرێ. لـە بـەر ئـەوەیش لێرەیـە هـەتا چـاوی بـە سـەر گواجیراییەکانەوە بێت، هـەتا دەرگاکـە بکەنـەوە و تابووتەکـە بزمـار ڕێـز بکـەن، کاتێـك ئـەوان دەبیـنم دێتـە پێشـەوە لـە جێـی خـۆم هەڵدەسـتم، دەسـتی منداڵەکـەم دەگـرم و کورسـییەکە هەڵـدەگرم و دەیبەمـە لای پەنجەرەکە هەتا ئـەو کاتـەی دەرگاکـە دەکەنـەوە خـەڵکی نـەمان بیـنن.

منداڵەکە کاسە، هەندێك جارێ و گێژ دەنوێنێ، لە تەنیشـتمەوە دانیشـتوە و چاو لە سوورپێستەکان دەکات. ئـەوان خـەریکی کردنـەوە و هـەڵگرتنی قوفڵەکانن، ئارەقە لە کونی لووتیان دەتکێ، بـە جیڕەجـیڕ و قرچـەقرچ و لێکترازانـی ژەنگوژارەکـان دەرگاکـە دەکرێتـەوە، پاشـان چـاوم بـە شـەقامەکە دەکـەوێ، تـەپوتۆزێکی سـپی و ڕوونـاك تـەواوی ماڵـەکانی داپۆشیبوو و شار هەر لە قەنەفـە و شـتومەکی کۆنـەی شەقوشـڕ دەچـێ، هەر دەڵێی خوداوەند نەفرەتی لە شـاری ماکانـدۆ کـردوە و وەك شـتێکی بێ بایەخ فڕێی داوەتە قوژبنێکی چۆڵوهۆڵی ئەم جیهانەوە.

بە دڵنیاییەوە لەو کاتەدا چاوی منداڵەکە بە هۆی ڕووناکییەکەوە بە شەوارە کەوتبوو. (ئەو کاتەی دەرگاکە کرایەوە، دەستی لە نێو دەستم دا بوو، وەك مێوژۆکە دەلەرزی.) لە ناکاو دێتەوە سەر خۆ و قیتوزیت سەری هەڵدێنێ و لێم دەپرسێ: «گوێت لێ بوو؟

لەو کاتەدا زانیم یەکێك لە دراوسێکان لە حەوشەیە و وەك قشقەرە کاتەکە ڕادەگەیەنێ و دەڵێ: «بەڵێ. کاتژمێر لە سێ گوزەراوە.

هەر لەو سەروبەندەدا یەکەم چەکووش لە بزمار دەدرێت، هەندێك خۆم دەخافڵێنم و هەوڵ دەدەم خۆم لە بستنی ئەو دەنگە پڕ ئازارە ببوێرم کە مووچڕك و تەزوو بە لەشم دا دەهێنێ. هەتا ئەو جێگایەی بۆم دەکرێ ترس و دڵەکۆتێکەم لە منداڵەکەم دەشارمەوە و بۆ ئەوەی هەستم پێ نەکات ڕووم بەرەو پەنجەرەکە وەردەگێرم و چاو لە کۆڵانێك ئەولاتر دەکەم، لە پشت دارباداممە غەمبار و تۆزاوییەکانەوە ماڵی خۆمانم لێوە دیارە.

ئەویش پڕە لە بۆنی نادیاری وێرانی و بە بێدەنگی و بەرەو هەرەسهێنان هەنگاو دەنێ. لەو کاتەوە کۆمپانیای مۆز شاری ماکاندۆی بەرەو وێرانی پەلکێش کرد، هەموو شوێنێك ئەو ڕەنگەی لێ نیشتوە، باداك ماڵەکەی داگرتوە گژوگیا تەرکی کۆڵانەکانی داپۆشیوە. دیوارەکان داڕووخاون و بە ڕۆژی ڕووناك مارمێلکە لە نێو ماڵەکاندا تریلیلانییەتی. لەو کاتەوە ئیتر ئیکلیلی کێوی و گوڵی هێندی مام لە باخچەکەمان دا نەچاندوە، لەو کاتەوەی دەستێکی شاراوە دەهات و قاپ و کەوچکی کریسمەسەکانمانی لە نێو کومێدەکەدا وردوخاش دەکرد و ئیزنی بە دارییەکان دا گەشە

بکەن و بەم لا و ئەو لای جل و پۆشاکەکاندا، کە ئێستا کەس لە بەریان ناکات، بێنە دەرێ. سەرلەبەری ژیان خەریکە فەشەل دەهێنێ، ئەو کاتەی لاولاوەی دەرگایەك لەق دەبێ و دەستێکی تامەزرۆ نییە توندی بکاتەوە، لەو کاتەوە بابم کەوت بە ئەرزدا و بۆ هەمیشە لاقی شەل بوو، ئەو توانایی و برستی جارانی نەماوە، ڕێبێکا خاتوون لە پشت باوەشێنەکەیەوە دانیشتوە.

ئیتر نیگەرانی هیچ شتێك نییە کە بتوانێ گڕی توونیەتی و چاوچنۆکی و دەروون پیسییەکەی دابمرکێنێت. ئەو ئازار و ژانەی ژیانی بێوەژن کۆشی لە دەروونی ئاخنی بوو، لە پێی خستوە. وا دیارە باوە ئانخێل بێجگە لە گرفت و باوپێچی بەردەوام (کە بە هۆی خواردنی کفتەوە، لە کاتی نووستنی دوانیوەڕۆدا دووچاری بوو) هیچ گلەییەکی تری نییە. تەنیا شتێك گۆڕانی بە سەردا هاتوە، گۆرانیگوتنی لفەودوانەکانی سێن خێرۆمێیە و ئەو ژنە سوالکەرە پڕ لە سرووپازەی دەڵێی دەستی پیری پێی ناوێرێ و لە ڕەنگ ناگۆڕێ، ئەوە بیست ساڵی تەواوە هەموو سێشەممەیەك بۆ وەرگرتنی چلێك لەو دارلیمۆیە سەردانی ماڵی ئێمە دەکات. تەنیا دەنگی هۆڕژنی شەمەندەفەرێکی زەرد و تەپوتۆزاوی، کە ئێستا هیچ کەس سواری نابێ، هەموو بەیانییەك چوار کەڕەت گۆمی کپ و بێدەنگی ئێرە دەشلەقێنێ و هەموو شەوێکیش دەنگی ئەو مۆلیدە کارەباییەی کۆمپانیای مۆز لە کاتی ڕۆیشتنی لە ماکاندۆ بە جێی هێشت بێدەنگیی شەو شەق دەکات.

لە پەنجەرەکەوە ماڵێم لێ دیارە و دەزانم زڕدایکم ئێستا لەوێیە. لە سەرەخۆ و بێ جووڵە لە سەرکورسییەکە دانیشتوە و لەوانەیە لە بیری ئەوە دابێ، بەر لە گەڕانەوەی ئێمە، تۆفان هەستێ و ئەم شارە لە سەر زەوی پاك بکاتەوە. ئەو کاتە بێجگە لە ئێمە کەس لەم شارەدا نامێنێ و هەموو دەڕۆن. لە بەر ئەوەی ئێمە بە هۆی ئەو سندووقانەی لە وەتاغەدا لە سەر یەکمان داناون، ڕۆحمان بە ڕۆحی ئەم خاکەوە گرێ دراوە و توانای کۆچ کردنمان نییە. ئەو سندووقانەی پێداویستییەکانی نێو ماڵەکەمان و کەرەستەی دایەگەورەکان و بابەگەورەکانی ئێمەی تێدایە و ساباتی ئەسپەکانی باوکم و دایکم کە لە کاتی ڕاکردن لە دەست شەڕ و هاتنیان بۆ ماکاندۆ کەڵکیان لێ وەرگرتبوون.
ئێمە بۆ یادەوەریی مردوە دوورەکانی خۆمان بەم خاکەوە نووساوین. ئەو سندووقانە لە سەردەمی شەڕەوە لەو وەتاغەدا بوون و ئەم دوانیوەڕۆیەیش کە لە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردن گەڕاینەوە، هەر لەوێدان. وەتاغی نووستنەکان پڕن لە مارمێلکە و خەڵکیش مات و بێدەنگ لەژێر باری بیرەوەرییەکانیان دا لە پێ کەوتوون.

£

£

لە ناکاو بابەگەورەم هەستایە سەرپێ... خۆی دەدا بە سەر گۆچانەکەی دا، سەرە چکۆڵەکەی دەباتە پێشێ، چاویلکەکەی ئەوەندە لە چاوی توند کردوە، هەر دەڵێی بەشێکە لە سەروچاوی. پێم وایە

چاویلکه لـه چـاوکردن بـۆ مـن کـارێکی زۆر دژوار و ئەسـتەمه، هـەر لـه بجووڵێمەوه له پشت گوێچکەکانمەوه بەر دەبێتەوه خوارێ؛ بـه دەم ئـەو فیکر و خەیاڵانەوه دەست به لووتم دا دەهێـنم، دایکـم چـاوم لـێ دەکـا و دەڵێ: «بێزارت دەکا؟

له وەڵامی دا دەڵێم —نا— بزەیەك دەزێته سەر لێوی. هەناسـەیەکی درێـژ هەڵدەکێشێ و دەڵێ: «دەڵێی زۆرت ئارەقـه کـردوه؟» ڕاسـت دەکـات... جلوبەرگەکـەم بـه لەشمـەوه نووسـاوه و هـەموو گیـانم دەکزێنێتـەوه... شەڵواره ئەستوور و مەخمەرییەکەم توند پەنجەی لـه لاقـەکانم ئاڵانـدوه، ئارەقه نووساندوویەتی به لاقەکانمەوه. دەڵێم: «بەڵێ .

دایکم دەنووشتێتەوه و گرێی بۆینباخەکەم بۆ شل دەکاتەوه و باوەشـێنم دەکات و دەڵێ: «کاتێك چووینەوه ماڵێ، ئاوێك بکه بـه خـۆت دا و تاوێـك بحەسێوه.

هەست دەکەم گوێم له دەنگێکه: «کاتائۆره...

لەو کاتەدا پیاوەکه به دەرگاکەی پشتەوەدا دێتەوه ژوورەوه، کڵاوەکـەی له سەری دادەگرێ و به ئەسپایی دێـت و دەچـێ. دەڵێـی لـەوه دەترسـێ مردوەکه خەبەری بێتەوه، دەیەوێ بابەگەورەم پێی نـەزانێ هاتوەتـەوه، له ناکاو پاڵێك به بابەگەورەمەوه دەنێ و ئەویش لـەترێك دەدا و خەریکـه به پێشدا بکەوێ، بەڵام گورجێك دەسـتی ئـەو پیـاوەی پـاڵی پێـوه نـاوه دەگـرێ و خـۆی لـه کەوتنەکـه ڕزگـار دەکـات، هـەموویان دەسـت لـه سێغارکێشان هەڵدەگرن و وێکڕا وەك چوار قشقەڕه که لـه سـەر تەختـەی دارتاشێکدا ڕیز بووبێتن بـه ڕیـز دانیشـتوون و لـه جێـی خۆیـان نـابزوون.

کاتێک پیاوەکە بە دەمانچەی لاکەلەکەیەوە خۆی دەکات بە ژووردا، قشقەڕەکان سەر دەنێن بە سەر یەکترییەوە و دەست دەکەن بە سرتوخورت و یەکێکیان هەڵدەستێتە سەرپێ و بەرەو مێزەکە دەچێ و قوتووی بزمارەکان و چەکووشەکە هەڵدەگرێ.

بابەگەورەم لە پەنای تابووتەکەدا لەگەڵ پیاوەکە خەریکی قسەکردنە. پیاوەکە دەڵێ: «نیگەران مەبە سەرهەنگ، دڵنیا بە هیچ شتێک ڕوو نادات.

بابەگەورەم دەڵێ: «منیش پێم وا نییە شتێکی ئەوتۆ ڕوو بدات.

– «ئێوە دەتوانن هەڵی بگرن و ببنە دەرێ و لە پەنای دیوارەکە لە لای چەپی گۆڕستانەکەوە بینێژن. لە نزیک دارە گوڵ هەوڕێشمە بەرزەکانەوە...

ئەو کاتەی کاغەزێک دەدا بە دەستی بابەگەورەمەوە و دەڵێ: «دەبینی کارەکان بە جوانی و بە ڕێکوپێکی بە ڕێوە دەچن.

بابەگەورەم بە دەستێکی خۆی داوە بە سەر گۆچانەکەی دا و بە دەستەکەی تری کاغەزەکەی دەنێتە گیرفانییەوە، ئەو شوێنەی کاتژمێرە زەردە چکۆڵە چوارسووچەکە تێ دەخات.

پیاوەکە دەڵێ: «چەند کەسێک لە پشت پەنجەرەکانەوەن، بەلام هیچ نییە، هەر بۆ سەر لێ دەرهێنان و زانینە و هیچی تر، ژنان هەر وان و پێیان خۆشە سەر لە هەموو کارێک دەربهێنن.

بەلام پێم وا نییە بابەگەورەم هەر گوێی لە دەنگیشی بووبێ. پیاوەکە لە جێی خۆی هەڵدەستێ و دەچێتە لای قەنەفەکە و بە پیاوەکان دەڵێ:

«ئێستا دەتوانن بزمارەکان لە تابووتەکە بدەن و ئەو دەرگایانەیش بکەنەوە با هەوایەکی تازە بێتە ژوورەوە.
پیاوەکان دەکەونە جموجۆڵ، یەکێکیان دەست دەداتە بزمار و چەکووش و دەچێتە گیانی تابووتەکە و ئەوانەی تریش بەرەو دەرگاکەکان بە ڕێ دەکەون.
دایکم هەڵدەستێ، ئارەقەی کردوە و ڕەنگی پەڕیوە. کورسییەکەی لا دەبات و دەستی من دەگرێ هەتا ڕێی پیاوەکان بەر بدەین و بچن دەرگاکان بکەنەوە. لە سەرەتاوە زۆریان هەوڵ دا بە زەبری قوڵێنگ بیانکەنەوە، بەڵام ژەنگوژار کردبوونی بە یەك پارچە و نەدەکرانەوە، هەر دەتگوت کەسێك لەو دیوی شەقامەکەوە پاڵیان پێوە دەنێ. کاتێك یەکێك لە پیاوەکان بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە پاڵی پێوە نا، جیڕەجیڕی داری لاشیپانەکە و لاولاوە ژەنگاوییەکان و قوفڵەکان نێو وەتاغەکەی پڕ کرد و دەرگاکە وەك زارکی دێوێك لە بەر یەك ڕەوییەوە.
بەر لەوەی بزانم چ شتێك ڕووی داوە، تیشك بە شەپۆل خۆی بە ژوورەکەدا دەکات و هەموو لایەك ڕووناك دەکاتەوە. لە بەر ئەوەی ئەو شوێنە هەستیارەی ئەوان بە زەبری شانوباهۆی خۆیان لایان برد، دوو سەد ساڵ بوو لە شوێنی خۆی نەبزووتبوو، کاتێك دەرگاکە بە ناڵە و هاوارێکی زۆرەوە لە ناوەڕاستی وەتاغەکەدا کەوت بە ئەرزدا، پیاوەکان دەهەژێن و وەك برووسکەیەکی فێگرتوو بەتووڕەییەوە دەڕژێنە ژوورەوە و لەتر دەبەستن و هەوڵ دەدەن خۆیان بە پێوە ڕا بگرن، هەتا تەوژمی شەپۆلی تیشکەکە نەیان دا بە ئەرزەکەدا. کاتێك دەرگاکە کرایەوە، لە

دوورەوە دەنگی قشقەڕەیەك دەهات. ئێستا دەتوانم شەقامەکە ببینم، دەتوانم تەپوتۆزە نوورانی و سوورەوەبوەکان ببینم، چەند پیاوێك لە نێو پیادەڕەوەکەدا دانیشتوون و دەستەکانیان لە یەك هەڵپێکاوە. دیسان گوێم لە دەنگی قشقەڕەکە دەبێ و بە دایکم دەڵێم: «گوێت لێ بوو؟

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: «بەڵێ. دەبێ کاتژمێر سێ بێ، بەڵام ئادێ پێی گوتبووم قشقەڕەکان ئەو کاتە دەقیڕێنن کە بۆنی مردوویان بە سەردا دەچێت، ڕاست لەو کاتەدا دەمەوێ ئەوە بە دایکم بڵێم، گوێم لە دەنگی پڕ لە ئازاری چەکووشێك دەبێ کە بزماری پێ دادەکوتن. تەقەتەقی چەکووشەکە لە نێو دیوەکەدا دەنگ دەداتەوە. ئەو دەنگە بەرز و بەردەوامە تەختە نووستوەکان لە خەو هەڵدەستێنێ، دایکم ڕووی بەرەو شوێنێکی ترەوە وەر چەرخاندوە و لە پەنجەرەکەوە دەڕوانێتە دەرێ و چاو لە شەقامەکە دەکات. کاتێك لە کاری بزمارداکوتانەکە دەبنەوە، دەنگی پۆلێك قشقەڕەم دێتە گوێ. بابەگەورەم ئاماژە بە پیاوەکانی دەکات، ئەوانیش دادێنەوە و تابووتەکە هەڵدەگرن و لەو کاتەدا ئەو پیاوەی دەمانچەکەی بە لاکەلەکەیەوە هەڵواسیبوو لە سووچێکەوە ڕاوەستابوو بە بابەگەورەمی گوت: «نیگەران مەبە سەرهەنگ.

بابەگەورەم وەك کەڵەبابی شەڕانی بای کردبوە بەر ملی و بەرغەبغەبەی وەك تۆپەڵەخوێن سوور هەڵگەڕا بوو، بە نیگەرانییەوە چاو لە قوژبنی وەتاغەکە دەکات، بەڵام بێدەنگە و هیچ ناڵێ. پیاوەکە دیسان دووپاتی دەکاتەوە و دەڵێ: «تەنانەت پێم وا نییە کەسێك لەم شارەدا هەبێ ئەم پیاوەی لە بیر مابێ.

دڵم بە یەکدا دێ، خەریکە پەرۆش دەبم، لە بەر خۆمەوە دەڵێم، هەستم بڕۆمە دەرێ، بەڵام هەست دەکەم تازە کار لە کار ترازاوە و درەنگە. پیاوەکان لاقیان لە ئەرزەکە توند دەکەن و قیت دەبنەوە و تابووتەکە لە ژێر شەپۆلی تیشکەکەدا دەکەوێتە مەلەکردن، هەر دەتگوت پاپۆڕێکی بێ گیانە و بەرەو گۆڕستانی دەبەن هەتا بینێژن. لە بەر خۆمەوە دەڵێم: «هەر ئێستا بۆنی ئەمەیشیان بە سەردا دەچێ. هەر ئێستا هەموو قشقەڕەکان بە یەکەوە دەنگ هەڵدەبڕن و دەست دەکەن بە گۆرانیگوتن.

١٩٥٥